

# زیاترلە سەد بەرهەمی تەقوا و ڕێگاکانی بە دەست خستنی


نوسینی

حسن علی بۆسکێنی


12/24/21

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿١١٩﴾
يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانًا
وَيُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو
ٱلۡفَضۡلِ ٱلۡعَظِيمِ ﴿٢٩﴾

## پێشەکی

الحمد لله ولی المتقين، والصــلاه والســلام على المبعوث رحمة للعالمين، وعلى اله و صحبه وأتباعه إلى يوم لقاء رب العالمين.

تێگەیشـــتن لە زاراوە قورئانیەکان دەرگایە بۆ خزمەت کردنی باشتری قورئانی پیرۆز، یەکێک لەو زاراوانەی کە زۆرترین بەرهەم و بەهرەی دین و دونیـای پێوە بەســتراوە وشــەی تەقوایە لە قورئـانی پیرۆز دا، بۆیە پێم بـاش بوو لێکۆڵینەوەیەک لە ســەر وشــەی تەقوا لە قورئان بکەم زۆر بە کورتی باســی بەرهەمەکانی تەقوا بکەم من تەرجومەی ئـایەتەکـانم نەکردوە بۆ ئەوەی زۆر درێژ نەبێتەوە، چوونکە تەرجومەی قورئان بە کوردی ئیستا زۆرە، وە هەم لەبەر ئەوەیە کە ئەم کتابە، زیاتر بۆ مامۆســتایان و ئەو کەسـانە نوسـراوە لە قورئان تێدەگەن بەراسـتی ڕێگای ڕاسـت بۆ تێگەیشـــتن لە قورئـانی پیرۆزە ئەوەیە کە کۆی ئـایەتەکـان کۆ بکەینەوە، ئەوکـات بەراوردیـان بکەین، دەبینین کە دەگەین بە نەتیجەیەکی باش لە دیراســەکە، ئەوەی بەردەســتان هەوڵێکی نا قابیلە بەرامبەر بە قورئانی پیرۆز، بەڵام هەر ویســـتم لە خزمەتی قورئـانی پیرۆز دابم بە پێی توانـا و هەم تەجروبەیەکیش بێ بۆ بەهرەمەند بوون لە قورئانی پیرۆز.

ئەی پەروەردگـار نزا دەکەین کە بمـانکەیە ئەهلی قورئـان و خزمەت کاری قورئان.

## مانای(تقوى) لە زمانەوانیدا

ئیبن فارس دەربارەی ماددەی تەقوا دەڵێ: (وَقَى) الْوَاوُ وَالْقَافُ وَالْيَاءُ: كَلِمَةٌ وَاحِدَةٌ تَدُلُّ عَلَى دَفْعِ شَيْءٍ عَنْ شَيْءٍ بِغَيْرِهِ. وَوَقَيْتُهُ أَقِيهِ وَقْيًا. وَالْوِقَايَةُ: مَا يَقِي الشَّيْءَ. وَاتَّقِ اللَّهَ: تَوَقَّهُ، أَيِ اجْعَلْ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ كَالْوِقَايَةِ. قَالَ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ: «اتَّقُوا النَّارَ وَلَوْ بِشِقِ تَمْرَةٍ» ، وَكَأَنَّهُ أَرَادَ: اجْعَلُوهَا وِقَايَةً بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهَا.

ماددەی" و، ق، ي: وشـەیەکە بە واتای لادانی شـتێک لە سـەر شـتێکی تر دێ، وە پاراسـتم، دەپارێزم بە پاراسـتن، وقايه ئەو شـتەیە کە شـتێکی تر دەپارێزێ، وَاتَّقِ اللَّهَ: تَوَقَّهُ، أَيِ اجْعَلْ بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ كَالْوِقَايَةِ، کەواتە تەقوای خوا بکە، یان خۆی لێ بپارێزە مانای وایە شـتێك لە نێوان خۆت و ئەو دابنێ وەک پارێزەر، پێغەمبەری خوا عليه الصـلاة والسـلام فەرمویەتی: خۆتان لە ئاگر بپارێزن ئەگەر بە کەرتە خورمایەکیش بێ. وەک ئەوە وایە مەبەستی ئەوە بووبێ بفەرموێ ئەم کەرتە خوورمایە لە نێوان خۆتان و ئاگر بکەنە هۆکاری خۆپاراسـتن[1] . کەواتە تقوى بەمانای پاراسـتنی شێکە لە شتێك، یان شتێکە بە شتێك.

## تقوى لە زاراوەی شرعیدا

---

[1] أحمد بن فارس بن زكرياء القزويني الرازي، أبو الحسين (المتوفى: 395هـ)
المحقق: عبد السلام محمد هارون
الناشر: دار الفكر
ب 6/ 131

راغبی ئەسفەهانی دەربارەی مانای شەرعی(تقوی) دەڵێ:

الوِقَايَةُ: حفظُ الشيءِ ممّا يؤذيه ويضرّه.

يقال: وَقَيْتُ الشـــيءَ أَقِيهِ وِقَايَةً ووِقَاءً. قال تعالى: فَوَقاهُمُ اللَّهُ (الإنسـان/ ﴿١١﴾) وَوَقاهُمْ عَذابَ الْجَحِيمِ (الدخان/ ﴿٥٦﴾) وَما لَهُمْ مِنَ اللَّهِ مِنْ واقٍ (الرعد/ ﴿٣٤﴾) ما لَكَ مِنَ اللَّهِ مِنْ وَلِيٍّ وَلا واقٍ(الرعد/ ﴿٣٧﴾) قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ ناراً (التحريم/ ﴿٦﴾)

والتَّقْوَى جعل النّفس في وِقَايَةٍ مما يخاف، هذا تحقيقه، ...... وصار التَّقْوَى في تعارف الشّرع حفظ النّفس عمّا يؤثم، وذلك بترك المحظور، ، ويتمّ ذلك بترك بعض المباحات......[1]

---

[1] المفردات في غريب القرآن
المؤلف: أبو القاسم الحسين بن محمد المعروف بالراغب الأصفهانى (المتوفى: 502هـ)
المحقق: صفوان عدنان الداودي
الناشر: دار القلم، الدار الشامية - دمشق بيروت
الطبعة: الأولى - 1412 هـ/ لا 881

# تەقوا لە سورەتەکانی قورئانی پیرۆز دا

## سورەتی البقره

**١.** ذَلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلَاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنْفِقُونَ ﴿٣﴾ وَالَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنْزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنْزِلَ مِنْ قَبْلِكَ وَبِالْآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ﴿٤﴾ أُولَئِكَ عَلَى هُدًى مِنْ رَبِّهِمْ وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٥﴾ البقرة

ســـودوو بەرهەمی تەقوا: بەرهەمی تەقوا ئەوەیە کە لە قورئان بەهرەمەند دەبی، سەرفرازی دوونیاو دوواڕۆژە.

ڕێگاکانی بەدەست خستنی تەقوا:

- ئیمان بە غەیب.
- نوێژ کردن.
- بەخشندەیی.
- ئیمان هەبوون بە هەموو کیتابەکانی ئاسمانیی پێشتر.
- ئیمان بە قورئان.
- یەقین هەبوون بە دوواڕۆژ.

**٢.** يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٢١﴾ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ فِرَاشًا وَالسَّمَاءَ بِنَاءً وَأَنْزَلَ مِنَ

السَّمَاءِ مَاءً فَأَخْرَجَ بِهِ مِنَ الثَّمَرَاتِ رِزْقًا لَكُمْ فَلَا تَجْعَلُوا لِلَّهِ أَنْدَادًا وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٢٢﴾

بەرهەمی عبودیەت، تەقوایە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا:

- وردبوونەوە لە درووستکراوەکان وەك زەوی کە ڕاخراوە.
- ئاسمان کە بینا کراوە.
- ئاو کە لە ئاسمان دابەزێنراوە.
- بەروو میوە کە بەو ئاوە وە دەرنراوە.

٣. وَإِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِنْ مِثْلِهِ وَادْعُوا شُهَدَاءَكُمْ مِنْ دُونِ اللَّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِنْ لَمْ تَفْعَلُوا وَلَنْ تَفْعَلُوا فَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿٢٤﴾

بەرهەمی تەقوا: پارێزرانە لە ئاگر.

ڕێگای تەقوا: وردبوونەوەیە لە تەحەددا و مەیدانگیری قورئانی پیرۆز.

٤. وَآمِنُوا بِمَا أَنْزَلْتُ مُصَدِّقًا لِمَا مَعَكُمْ وَلَا تَكُونُوا أَوَّلَ كَافِرٍ بِهِ وَلَا تَشْتَرُوا بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلًا وَإِيَّايَ فَاتَّقُونِ ﴿٤١﴾

بەرهەمی تەقوا: ئەوەیە کە بەس لە خوا دەترسی.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ئیمان هێنان بە قورئانە و بێ باوەڕ نەبوونە پێی.

٥. وَاتَّقُوا يَوْمًا لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ شَيْئًا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا شَفَاعَةٌ وَلَا يُؤْخَذُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا هُمْ يُنْصَرُونَ ﴿٤٨﴾

بەرهەمی تەقوا: ڕزگاربوونە لەم ڕۆژەی کە کەس لە فریای کەس ناکەوێ.

ڕێگای تەقوا بیرکردنەوەیە لە نیعمەتەکانی، وەك لە ئایەتی پێشتر دا دەردەکەوێ.

٦. وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾

بەرهەمی تەقوا: ڕزگاربوونە لە سزای بەسەردا ڕمانی چیایەکە.

ڕێگای بە دەست خستنی: بەهێز و جدیەوە دەست بە کتابی خواوە بگری.

٧. وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَوْا مِنْكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُوا قِرَدَةً خَاسِئِينَ ﴿٦٥﴾ فَجَعَلْنَاهَا نَكَالًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾

بەرهەمی تەقوا: پەند و ئامۆژگاری وەرگرتنە لە ڕووداوەکان و نەبوون بە مەیمونە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: دەست درێژی نەکردنە لە سنورەکانی خوا وەك بەنوو ئیسرائیل کردیان.

٨. وَلَوْ أَنَّهُمْ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَمَثُوبَةٌ مِنْ عِنْدِ اللَّهِ خَيْرٌ لَوْ كَانُوا يَعْلَمُونَ ﴿١٠٣﴾

بەرهەمی تەقوا: دەســت خســتنی پاداشــتی گەورەی خوا بوو ئەگەر جادوویان نەکردبا، یاخوو بەو شــێوە مامەڵەیان لە گەڵ کردبا کە بۆیان دیاری کرابوو کە لێک جیاکردنەوەی موعجیزە لە جادوو بوو.

ڕێگـای تەقوا: وازهێنـان لە جـادوو، وە شــوێن نەکەوتنی ئەو خورافیاتانەی کە سەبارەت بە سولەیمان گوتراوە سەلامی خوای لەسەر بێ.

٩. وَاتَّقُوا يَوْمًا لَا تَجْزِي نَفْسٌ عَنْ نَفْسٍ شَيْئًا وَلَا يُقْبَلُ مِنْهَا عَدْلٌ وَلَا تَنْفَعُهَا شَفَاعَةٌ وَلَا هُمْ يُنْصَرُونَ ﴿١٢٣﴾

بەرهەمی تەقوا: ڕیســوا نەبوونە لە دووارۆژ دا کە کەس هیچی بۆ کەس پێناکرێ، وە کەس فیدیەی لێ وەرناگیرێ، وە تکای کەس سودی نیە بۆ ئەوان، وە ڕزگاریان نابێ و سەرناخرێن.

ڕێگای بە دەســت خســتنی: قورئان خوێندنەوەیەکی بە حەق و شــوێن نەکەوتنی جولەکە و گاور وەك لە ئایەتەکانی پێشــوو دەر دەکەوێ.

١٠. لَيْسَ الْبِرَّ أَنْ تُوَلُّوا وُجُوهَكُمْ قِبَلَ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنْ آمَنَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَالْمَلَائِكَةِ وَالْكِتَابِ وَالنَّبِيِّينَ وَآتَى الْمَالَ عَلَى حُبِّهِ ذَوِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينَ وَابْنَ السَّبِيلِ وَالسَّائِلِينَ وَفِي الرِّقَابِ وَأَقَامَ الصَّلَاةَ وَآتَى الزَّكَاةَ وَالْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَاهَدُوا وَالصَّابِرِينَ فِي الْبَأْسَاءِ وَالضَّرَّاءِ وَحِينَ الْبَأْسِ أُولَئِكَ الَّذِينَ صَدَقُوا وَأُولَئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾

بەرهەمی تەقوا: گەیشتنە بە پلەی چاکە و ڕاستی و پارێزکاری (البر والتقوى الصدق).

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: بڕواکردن بە پایەکانی ئیمان کە لە ئایەتەکەدا هاتووە، بەخشندەیی بە حاڵەتی لە خۆبردوویی و حەزکردن بە بەخشندەیی، وە پێدانی ماڵ بەو کەسانەی کە شایەنن کە باس کراون لە خزمان، هەتیوان، هەژاران و ڕێبواران و داواکاران بۆ ئازادکردنی بەندەکان، نوێژ و زەکات و وەفا بە بەڵێن کردن، خۆڕاگری لە بەرامبەر هەژاری، نەخۆشی، ڕووبەڕوو بوونەوەی دووژمنان.

١١. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِّ وَالْعَبْدُ بِالْعَبْدِ وَالْأُنْثَى بِالْأُنْثَى فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وَأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَلِكَ تَخْفِيفٌ مِنْ رَبِّكُمْ وَرَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَى بَعْدَ ذَلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٧٨﴾ وَلَكُمْ فِي الْقِصَاصِ حَيَاةٌ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴿١٧٩﴾

بەرهەمی تەقوا: گەیشتن بە ئەمن و دڵنیای لەگیان و ماڵ، وە تەحقیقی دادگەری.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: بەرقەرار کردنی سزادان، دادگەری لە تۆڵە سەندنەوە، بەیەکتر دانەوەی مافەکان.

١٢. كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِنْ تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾

بەرهەمی تەقوا: وەسـیەت کردنە بۆ نزیکەکـان و ئـازیزان، کە مسـوڵمان دوای مردنیشـی دەیەوێ زۆرترین قازانج بە دەورووبەر بگەیەنێ.

ڕێگای دەست خستنی تەقوا: ستەم نەکردن لە وەسیەت.

١٣. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾

بەرهەمی تەقوا: ئیلتزام و پابەندیە، هەروەها بەهرەمەند بوون لە قورئان. هەروەها تەکبیرو الله اکبر کردن و هیدایەت و شـوکر کردن و گیرابوونی دوعا وەك لە ئایەتەکانی دواتر دەردەکەوێ.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: بەڕۆژوو بوون.

١٤. أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَائِكُمْ هُنَّ لِبَاسٌ لَكُمْ وَأَنْتُمْ لِبَاسٌ لَهُنَّ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ كُنْتُمْ تَخْتَانُونَ أَنْفُسَكُمْ فَتَابَ عَلَيْكُمْ وَعَفَا عَنْكُمْ فَالْآنَ بَاشِرُوهُنَّ وَابْتَغُوا مَا كَتَبَ اللَّهُ لَكُمْ وَكُلُوا وَاشْرَبُوا حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَكُمُ الْخَيْطُ الْأَبْيَضُ مِنَ الْخَيْطِ الْأَسْوَدِ مِنَ الْفَجْرِ ثُمَّ أَتِمُّوا الصِّيَامَ إِلَى اللَّيْلِ وَلَا تُبَاشِرُوهُنَّ وَأَنْتُمْ عَاكِفُونَ فِي الْمَسَاجِدِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَقْرَبُوهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ آيَاتِهِ لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٨٧﴾

بەرهەمی تەقوا: پاراستنی سنوورەکان.

ڕێگای تەقوا: خۆپاراستنە لەو شتانەی کە زیان بە ڕۆژوو دەگەیەنن وەك جوتبوون لە ڕۆژ دا، خواردن و خواردنەوە، وتە و کرداری بێ سوود.

١٥. وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنْتُمْ تَعْلَمُونَ﴿١٨٨﴾ يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَهِلَّةِ قُلْ هِيَ مَوَاقِيتُ لِلنَّاسِ وَالْحَجِّ وَلَيْسَ الْبِرُّ بِأَنْ تَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ ظُهُورِهَا وَلَكِنَّ الْبِرَّ مَنِ اتَّقَى وَأْتُوا الْبُيُوتَ مِنْ أَبْوَابِهَا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٨٩﴾

بەرهەمی تەقوا: سەرفرازی و بەختەوەریە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ڕەچاوکردنی ئادابی گەڕانەوەی ماڵ، کە عەرەبەکان نەریتیان وابوە بەسەر دیواردا هاتوونە ژور کە لە سەفەرێک گەرابانەوە، وە ڕەچاوکردنی ئادابی چونە مالانی ترە.

١٦. لشَّهْرُ الْحَرَامُ بِالشَّهْرِ الْحَرَامِ وَالْحُرُمَاتُ قِصَاصٌ فَمَنِ اعْتَدَى عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا اعْتَدَى عَلَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ﴿١٩٠﴾

بەرهەمی تەقوا: پشت و پەنابوون و لەگەڵ دا بوونی پەروەردگارە بۆ بەندەکەی ئەگەر بێت و تەقوا کاربێ.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: قبوڵ نەکردنی زوڵم و دەست درێژییە.

**١٧.** وَأَتِمُّوا الْحَجَّ وَالْعُمْرَةَ لِلَّهِ فَإِنْ أُحْصِرْتُمْ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ وَلَا تَحْلِقُوا رُءُوسَكُمْ حَتَّى يَبْلُغَ الْهَدْيُ مَحِلَّهُ فَمَنْ كَانَ مِنْكُمْ مَرِيضًا أَوْ بِهِ أَذًى مِنْ رَأْسِهِ فَفِدْيَةٌ مِنْ صِيَامٍ أَوْ صَدَقَةٍ أَوْ نُسُكٍ فَإِذَا أَمِنْتُمْ فَمَنْ تَمَتَّعَ بِالْعُمْرَةِ إِلَى الْحَجِّ فَمَا اسْتَيْسَرَ مِنَ الْهَدْيِ فَمَنْ لَمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَاثَةِ أَيَّامٍ فِي الْحَجِّ وَسَبْعَةٍ إِذَا رَجَعْتُمْ تِلْكَ عَشَرَةٌ كَامِلَةٌ ذَلِكَ لِمَنْ لَمْ يَكُنْ أَهْلُهُ حَاضِرِي الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿١٩٦﴾

بەرهەمی تەقوا: خۆپاراستنە لە سزای خوای گەورە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: پابەندبوون بە ئادابەکانی حەج و عومرە و ئەنجامدانی بە تەواوترین شـێوە، ئەگەر لە شـوێنێك کەفارەتت کەوتە سـەر تەواو پابەند بی بە کەفارەتەکان وەك لە ئایەتەکەدا هاتووە.

١٨. الْحَجُّ أَشْهُرٌ مَعْلُومَاتٌ فَمَنْ فَرَضَ فِيهِنَّ الْحَجَّ فَلَا رَفَثَ وَلَا فُسُوقَ وَلَا جِدَالَ فِي الْحَجِّ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ يَعْلَمْهُ اللَّهُ وَتَزَوَّدُوا فَإِنَّ خَيْرَ الزَّادِ التَّقْوَى وَاتَّقُونِ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ ﴿١٩٧﴾

بەرهەمی تەقوا: بوونە خاوەنی زۆرترین پاداشـت و تێشـوو بۆ قیامەت.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: حەج کردنێکی پڕ مانا و ئیلتیزام کە دوور بێ لە هەڵوەشێنەرەوەکانی کەم کەرەوەی پاداشتەکان.

١٩. وَاذْكُرُوا اللَّهَ فِي أَيَّامٍ مَعْدُودَاتٍ ۚ فَمَنْ تَعَجَّلَ فِي يَوْمَيْنِ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ وَمَنْ تَأَخَّرَ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ ۚ لِمَنِ اتَّقَىٰ ۗ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ 

بەرهەمی تەقوا: لاچوونی حەرەج و تاوان و گەڕانەوە لای خوا بە سەربەرزی.

ڕێگای دەست خستنی تەقوا: یادکردنی خوای گەورە لە ڕۆژەکانی جەژنی قوربان و دواتر...

٢٠. وَإِذَا قِيلَ لَهُ اتَّقِ اللَّهَ أَخَذَتْهُ الْعِزَّةُ بِالْإِثْمِ فَحَسْبُهُ جَهَنَّمُ وَلَبِئْسَ الْمِهَادُ 

بەرهەمی تەقوا: دووربوون لە ڕەوشتی دوو ڕوو و تاوانبارەکان کە هەرگیز سوود لە ئامۆژگاری وەرناگرن.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ناسینی نیفاق و تاوانبار و پابەند بوون بە ڕەوشتە بەرزەکان لەوانە سود وەرگرتن لە پەند و ئامۆژگاریەکان.

٢١. زُيِّنَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَيَسْخَرُونَ مِنَ الَّذِينَ آمَنُوا وَالَّذِينَ اتَّقَوْا فَوْقَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَاللَّهُ يَرْزُقُ مَنْ يَشَاءُ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿٢١٢﴾

بەرهەمی تەقوا: لەقیامەت دا ڕزگار بوو لە ئاگر و گاڵتە کردن بە بێ باوەڕان ئەوانەی گاڵتەیان دەکرد بە بڕواداران، وە ڕزق و ڕۆزی فراوان.

ڕێگای بە دەســـت خســـتنی تەقوا: فریو نەخواردن بە زریق و بریقی دونیا و گاڵتە نەکردن بە خەڵك بەگشـــتی و باوەڕداران بە تایبەت.

٢٢. نِسَاؤُكُمْ حَرْثٌ لَكُمْ فَأْتُوا حَرْثَكُمْ أَنَّى شِئْتُمْ وَقَدِّمُوا لِأَنْفُسِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّكُمْ مُلَاقُوهُ وَبَشِّرِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿٢٢٣﴾

بەرهەمی تاقوا: گەیشـــتن بە پەروەردگارو و مزگێنی بە هەموو شتێکی باش چونکە دیاری نەکراوە مزگێنیان بە چ پێ دەدرێ.

ڕێگای بە دەســـت خســـتنی تەقوا: جوت بون لەگەڵ خێزان لە ڕێگای شـــەرعی ڕێگە پێدراوە، وە لە کاتی چونە لای خێزان نیەتی باشت هەبێ وەك:

- خۆپاراستن لە تاوان.
- منداڵی ساڵح.
- ئارامی دەروونی و خێزانی.
- خۆشەویستی.
- ڕزق و ڕۆزی.
- زیندوو کردنەوەی سونەتی سەروەرمان.
- بەردەوام بوونی جۆری ئینسانی بە ڕێگای تەندروست.
- بەدیهێنانی شـانازی سـەروەرمان علیه الصلاه والسـلام بە زۆری ئوممەتەکەی.
- خۆشەویستی خێزانی.

٢٣. وَلَا تَجْعَلُوا اللَّهَ عُرْضَةً لِأَيْمَانِكُمْ أَنْ تَبَرُّوا وَتَتَّقُوا وَتُصْلِحُوا بَيْنَ النَّاسِ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴿٢٢٤﴾

بەرهەمی تەقوا: بە گەورەگرتنی خوا لەوەی کە سوێندی بە نابەجێ پێ بخورێ.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: سوێند خواردن نەکەیتە ڕێگر لە کاری باش و سوڵح و لە خواترسان.

٢٤. وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِتَعْتَدُوا وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنْزَلَ عَلَيْكُمْ مِنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُمْ بِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٣١﴾

بەرهەمی تەقوا: پەند وەرگرتن لەوەی خوای گەورە ناردوویەتی لە قورئان و سونەت و ئامانجەکانی شەریعەت.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: چاك بوون لەگەڵ خێزان هەتا لەکاتی جیابوونەوەش زیانی پێ نەگەیەنی، وەئەگەر گرتەوە لای خۆت بە ئامانجی زیان پێ گەیاندن نەبێ، دەنا ئەو کات دەبیە گاڵتەچی بە یاساکانی خوا پەنا بەخوا، ئەم ئایەتە توندترین و پڕ هەرەشەترین ئایەتە لەو کەسانەی کە لەکاتی جیابوونەوەدا ستەم لە خێزانەکانیان دەکەن.

٢٥. وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَنْ يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لَا تُضَارَّ وَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَنْ تَرَاضٍ مِنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدْتُمْ أَنْ تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُمْ مَا آتَيْتُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٣﴾

بەرهەمی تەقوا: پاراستنی خاوەن شیرەکە کە باوک و، پاراستنی شیردەرەکە کە دایکە، پاراستنی شیر پێ دراوەکە کە منداڵەکەیە، پاراستنی شیرازەی کۆمەڵایەتیە، چونکە خێزان لەوانە پێک دێ.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ڕەچاوکردنی مافەکانە، مافی هەموو ئەوانەی کە خاوەن مافن.

٢٦. وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَنْ يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلَا تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ﴿٢٣٧﴾

بەرهەمی تەقوا: لەکاتی جیابوونەوی ژن و مێرد زۆربەی کات خەراپە و ستەم ڕوودەدات بۆیە لە پاڵ ئایەتەکانی جیابوونەوە باسی تەقوا کراوە، خوای گەورە بەڵێن و بەخشش و لێبووردنی خۆی داوە بۆ پارێزکاران.

٢٧. ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: چ ژن چ مێرد با لێبووردە و بەخشندە بێ لەکاتی جیابوونەوەدا.

٢٧. وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ ﴿٢٤١﴾

بەرهەمی تەقوا: بەرهەمی تەقوا ماف وەرگرتنە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ستەم نەکردنە لە کاتی جیابوونەوە.

٢٨. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَذَرُوا مَا بَقِيَ مِنَ الرِّبَا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴿٢٧٨﴾

بەرهەمی تەقوا: وازهێنان لە ڕیبا، وەدیهاتن و کامڵ بوونی ئیمانە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: وازهێنان لە ڕیبا، بزانی ڕیبا شەڕە لەگەڵ خەڵکی خوا، شەڕە لەگەڵ یاسا و دینی خوا، واتە خواردنی ڕیبا یەکسانە بە شەڕ لەگەڵ خوا سبحانە وتعالی.

٢٨. وَاتَّقُوا يَوْمًا تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللَّهِ ثُمَّ تُوَفَّى كُلُّ نَفْسٍ مَا كَسَبَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿٢٨١﴾

بەرهەمی تەقوا: تەقوا دڵنیایی و ئارامیە لە قیامەت، وە دوور بوونە لە هەر ستەمێك.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: بیرکردنەوە لە دوا ڕۆژ، ئەو دواڕۆژەی کە هەموو مرۆڤایەتی تێیدا لە خزمەتی خوا ڕادەگیرێ.

٣٠. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَدَايَنْتُمْ بِدَيْنٍ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى فَاكْتُبُوهُ وَلْيَكْتُبْ بَيْنَكُمْ كَاتِبٌ بِالْعَدْلِ وَلَا يَأْبَ كَاتِبٌ أَنْ يَكْتُبَ كَمَا عَلَّمَهُ اللَّهُ فَلْيَكْتُبْ

وَلْيُمْلِلِ الَّذِى عَلَيْهِ الْحَقُّ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا يَبْخَسْ مِنْهُ شَيْئًا فَإِنْ كَانَ الَّذِى عَلَيْهِ الْحَقُّ سَفِيهًا أَوْ ضَعِيفًا أَوْ لَا يَسْتَطِيعُ أَنْ يُمِلَّ هُوَ فَلْيُمْلِلْ وَلِيُّهُ بِالْعَدْلِ وَاسْتَشْهِدُوا شَهِيدَيْنِ مِنْ رِجَالِكُمْ فَإِنْ لَمْ يَكُونَا رَجُلَيْنِ فَرَجُلٌ وَامْرَأَتَانِ مِمَّنْ تَرْضَوْنَ مِنَ الشُّهَدَاءِ أَنْ تَضِلَّ إِحْدَاهُمَا فَتُذَكِّرَ إِحْدَاهُمَا الْأُخْرَى وَلَا يَأْبَ الشُّهَدَاءُ إِذَا مَا دُعُوا وَلَا تَسْأَمُوا أَنْ تَكْتُبُوهُ صَغِيرًا أَوْ كَبِيرًا إِلَى أَجَلِهِ ذَلِكُمْ أَقْسَطُ عِنْدَ اللَّهِ وَأَقْوَمُ لِلشَّهَادَةِ وَأَدْنَى أَلَّا تَرْتَابُوا إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً حَاضِرَةً تُدِيرُونَهَا بَيْنَكُمْ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَلَّا تَكْتُبُوهَا وَأَشْهِدُوا إِذَا تَبَايَعْتُمْ وَلَا يُضَارَّ كَاتِبٌ وَلَا شَهِيدٌ وَإِنْ تَفْعَلُوا فَإِنَّهُ فُسُوقٌ بِكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿٢٨٢﴾

بەرهەمی تەقوا: لە ئایەتی قەرز دووجار باسی تەقوا کراوە، جارێکیان لەگەڵ ئەو کەسەی قەزدارە وە دەبێ لەخوا بترسێ و دان بنێ بە مافەکەدا، جارێکیان لەگەڵ ئەوەی زیان نەگا بە گەواهیدەر و نوسەرەکان، چوونکە ئەگەر ئەوان هەرەشەیان لەسەر بێ حەق جێبەجێ ناکرێ و مافەکان نادرێن و داد پەروەری ناچەسپێ.

٣١. وَإِنْ كُنْتُمْ عَلَى سَفَرٍ وَلَمْ تَجِدُوا كَاتِبًا فَرِهَانٌ مَقْبُوضَةٌ فَإِنْ أَمِنَ بَعْضُكُمْ بَعْضًا فَلْيُؤَدِّ الَّذِى اؤْتُمِنَ أَمَانَتَهُ وَلْيَتَّقِ اللَّهَ رَبَّهُ وَلَا تَكْتُمُوا الشَّهَادَةَ وَمَنْ يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ﴿٢٨٣﴾

بەرهەمی تەقوا: ئەوەیە سپاردەکان بدەیەوە بە خاوەنەکانیان متمانەی خەڵك بەخۆت لەدەست نەدەی.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: خوای گەورە چوار ڕێگای داناوە بۆ ئەوەی قەرز جێگای خۆی بگرێ و بە زایا نەچێ:

- نووسین
- شایەتی گرتن
- بارمتە وەرگرتن
- متمانە بە یەکتر کردن

ئەگەر خەڵك ئەم ئایەتە جێبەجێ بکەن لە قەرزو مامەڵەکانیان دا قەت ئەوەندە توشی کێشە نەدەبوون.

رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِنْ نَسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْرًا كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِنَا ۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلْنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِ ۖ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا ۚ أَنْتَ مَوْلَانَا فَانْصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ ﴿٢٨٦﴾

ئەم نزایە کۆکەرەوەی نزاکانە زۆر گونجاوە لەگەڵ ئەرك و فەرمانەکانی ئەم سورەتە و بە دیهاتنی تەقوای خوای گەورە.

## سورەتی ال عمران

١. قُلْ أَؤُنَبِّئُكُمْ بِخَيْرٍ مِنْ ذَلِكُمْ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا وَأَزْوَاجٌ مُطَهَّرَةٌ وَرِضْوَانٌ مِنَ اللَّهِ وَاللَّهُ بَصِيرٌ بِالْعِبَادِ ﴿١٥﴾

بەرهەمی تەقوا: بەهەشتی پڕ نازوو نیعمەت و ئافرەتانی پاك و ڕەزامەندی خوا.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ئەوەیە کە بە نیعمەتەکانی دوونیا فریوو نەخۆی، بەڵکو لە جێگای خۆیدا بە کاری بێنی.

٢. لَا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِنْ دُونِ الْمُؤْمِنِينَ وَمَنْ يَفْعَلْ ذَلِكَ فَلَيْسَ مِنَ اللَّهِ فِي شَيْءٍ إِلَّا أَنْ تَتَّقُوا مِنْهُمْ تُقَاةً وَيُحَذِّرُكُمُ اللَّهُ نَفْسَهُ وَإِلَى اللَّهِ الْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾

بەرهەمی تەقوا: (توقیە) خۆپاراستن لە دووژمن.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ئەوەیە کە وریابی لە هەڵس و کەوت لەگەڵ دووژمنان، نە تەسلیمیان بی و نەخۆت ئەوەندە زەق کەیەوە کە کار و چالاکی دینداریت پەکی کەوێ.

٣. وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيَّ مِنَ التَّوْرَاةِ وَلِأُحِلَّ لَكُمْ بَعْضَ الَّذِي حُرِّمَ عَلَيْكُمْ وَجِئْتُكُمْ بِآيَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿٥٠﴾

بەرهەمی تەقوا: و تاعەت ئاسان بوون و گۆڕانکاری لە حوکمەکاندایە وەك ئەوەی بۆ عیسی ڕوویدا سەلامی خوای لەسەر بێ.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: بڕواکردن و بەڕاست دانانی پەیام و بڕیارەکانی خوایە.

٤. بَلَى مَنْ أَوْفَى بِعَهْدِهِ وَاتَّقَى فَإِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٧٦﴾

بەرهەمی تەقوا: بوون بە خۆشەویستی خوا.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: وەفا کردن بە بەڵێنەکان.

٥. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾

بەرهەمی تەقوا: عاقیبەت خێری و بە مسوڵمانەتی مردنە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ئەوەیە گوێڕایەڵی بێباوەڕان نەکەی لە خاوەن کتابەکان و غیری ئەوانیش.

٦. لَيْسُوا سَوَاءً مِنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ ﴿١١٣﴾ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ ﴿١١٤﴾ وَمَا يَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَلَنْ يُكْفَرُوهُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ ﴿١١٥﴾

بەرهەمی تەقوا: هەرچی چاکەیەك بیکەی بە زایا ناچێ (فلن یکفروه) دەچییە ناو ڕیز و کۆمەڵی چاکەکاران.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا:

- شەو نوێژ
- خوێندنەوەی ئایەتەکانی خوا سبحانە وتعالی
- کڕنۆش بردن بۆ خوا
- ئیمانی ڕاستەقینە بە خوا و بە دوواڕۆژ
- فەرمان بە چاکە
- ڕێگری لە خەراپە
- پەلەکردن لە چاکە

٧. إِنْ تَمْسَسْكُمْ حَسَنَةٌ تَسُؤْهُمْ وَإِنْ تُصِبْكُمْ سَيِّئَةٌ يَفْرَحُوا بِهَا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا لَا يَضُرُّكُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئًا إِنَّ اللَّهَ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿١٢٠﴾

بەرهەمی تەقوا: ئەوەیە کە دووژمنان زیانت پێ ناگەیەنن، مەبەست ئەوە نیە هیچ زیانێکی ماددیمان پێ ناگەیەنن، بەڵکوو ئەوەیە ناتوانن پاش گەزمان کەنەوە و بەرەو دوامان بەرنەوە، وە سەرئەنجام بۆ پارێزکاران دەبێ.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ئەوەیە کە دڵنیابین دووژمنان بە ئێمە دڵخۆش نین خۆشیان ناوێین، بۆیە دەبێ لەبازنەی هەڵسوکەوت دەرنەچێ و نەیان کەینە جێی متمانە و دۆستی نزیکی خۆمان، ئەمانە زیاتر بۆ کافرێکی جەنگی بەکاردێ دەنا پێغەمبەری خوا متمانەی بە عبدالله ی کوری ئەرقت کرد کە موشریکین بوو کردییە دەلیل و ئەمیندار بۆ دەرچوون لە مەککە بەرەو مەدینە.

٨. وَلَقَدْ نَصَرَكُمُ اللَّهُ بِبَدْرٍ وَأَنْتُمْ أَذِلَّةٌ فَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢٣﴾

بەرهەمی تەقوا: تەقوا ڕێگایە بۆ گەیشتن بە شوکر.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: خۆ زەلیل کردن بۆ خوا هۆکاری سەرکەوتن و گەیشتنە بە تەقوا.

٩. بَلَىٰ إِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا وَيَأْتُوكُمْ مِنْ فَوْرِهِمْ هَٰذَا يُمْدِدْكُمْ رَبُّكُمْ بِخَمْسَةِ آلَافٍ مِنَ الْمَلَائِكَةِ مُسَوِّمِينَ ﴿١٢٥﴾

بەرهەمی تەقوا: دابەزینی فریشتەکان وەک مەدەدوو یارمەتی لە جەنگا.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: گوێڕایەلی بۆ پێغەمبەر و خۆڕاگری لە بەرامبەر دووژمناندا.

١٠. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا الرِّبَا أَضْعَافًا مُضَاعَفَةً وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾

بەرهەمی تەقوا: نەخواردنی ڕیبا گەیشتنە بە سەرفرازی یەکجاری.

ڕێگای دەست خستنی تەقوا: وەڵامدانەوەی بانگەوازی ئیمان بەهۆی تەرکی ڕیبا، هۆکاری گەیشتنە بە سەرفرازی.

١١. وَاتَّقُوا النَّارَ الَّتِي أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ ﴿١٣١﴾

بەرهەمی تەقوا: ڕزگاربوون لە ئاگر.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ترسان و خۆپاراستن لە ئاگر بەتایبەت بەهۆی نەخواردنی ریبا.

١٢. وَسَارِعُوا إِلَى مَغْفِرَةٍ مِنْ رَبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالْأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾ الَّذِينَ يُنْفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾ وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنْفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَنْ يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴿١٣٥﴾

بەرهەمی تەقوا: چونە بەهەشتێك کە بەرینیەکەی بەقەدەر ئاسمان و زەویە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا:

- بەخشین لە هەبوون و نەبوون.
- ڕقی خۆ خواردنەوە.
- بەخشینی خەڵك.
- چاکە لەگەڵ ئەوکەسەی خەراپەت لەگەڵ دەکات.
- ئەگەر تاوانت لەگەڵ خەڵکدا کرد یان لەگەڵ خۆتدا داوای لێبووردن لە خوا دەکەن خوایان بیر دەکەوێتەوە.
- لەسەر تاوانەکە بەردەوام نابن.

١٣. هَذَا بَيَانٌ لِلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٨﴾

بەرهەمی تەقوا: بەرچاو ڕوونی و هیدایەت و پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: گەڕان لە زەویدا و سەرنج دان لە حاڵی گەلانی پێشوو ئاخۆ بە چ ڕزگاریان بوو، وە بەچی لەناو چوون.

١٤. مَا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ عَلَى مَا أَنْتُمْ عَلَيْهِ حَتَّى يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ وَلَكِنَّ اللَّهَ يَجْتَبِي مِنْ رُسُلِهِ مَنْ يَشَاءُ فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ وَإِنْ تُؤْمِنُوا وَتَتَّقُوا فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾

بەرهەمی تەقوا: دەست خستنی پاداشتی هەرە گەورە کە خۆی دەبینێتەوە لە ڕەزامەندی پەروەردگار و بەهەشتی ڕازاوە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ئیمتحان و تاقیکردنەوەی پەروەردگار بۆ بەندەکانی، وە ئەوانەی لە تاقیکردنەوە دەردەچن.

١٥. لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا أَذًى كَثِيرًا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴿١٨٦﴾

بەرهەمی تەقوا: گەیشتن بە پلەی گەورەیی و عەزیمەت و دامەزراوەی.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: دەرچوون لە تاقیکردنەوەی ماڵ و مناڵ و بەرگە گرتنی ئازاری دووژمنان.

١٧. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾

بەرهەمی تەقوا: سەرفرازی هەردوو دونیا.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ئیمان و خۆڕاگری و سەنگەر گرتن لە دووژمنانی خوا و زاڵبوون لە خۆڕاگریدا بەسەر دووژمناندا.

## سوڕەتی النساء

١. يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾

بەرهەمی تەقوا: گەیشتن بە پلەی هەست کردن بە چاودێری خوای گەورە.

ڕێگای بە دەست خستی تەقوا: بیرکردنەوە لە سەرەتای درووست بوونی بۆ ئەوەی خاوەنی خۆت بناسی و شەرمی لێ بکەی، وە کە بەناوی خوا داوای شتێکت لێکرا بەدەنگیەوە بچی، وە ڕێزگرتن لە پەیوەندی خزمایەتی.

٢. وَلْيَخْشَ الَّذِينَ لَوْ تَرَكُوا مِنْ خَلْفِهِمْ ذُرِّيَّةً ضِعَافًا خَافُوا عَلَيْهِمْ فَلْيَتَّقُوا اللَّهَ وَلْيَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٩﴾

بەرهەمی تەقوا: سەر ڕاستی و وتەی بەجێ، هەمان چاکە دێتەوە سەر ڕێت کاتێك لە کاتی سەرەمەرگدا دەبییە سەر وەسیەتی یەکێك و ستەمی تێدا ناکەی.

٣. أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوا أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ الْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِنْهُمْ يَخْشَوْنَ النَّاسَ كَخَشْيَةِ اللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً وَقَالُوا رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا الْقِتَالَ لَوْلَا أَخَّرْتَنَا إِلَى أَجَلٍ قَرِيبٍ قُلْ مَتَاعُ الدُّنْيَا قَلِيلٌ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ لِمَنِ اتَّقَى وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾

بەرهەمی تەقوا: بردنەوەی ژیانی هەتا هەتای لە دووارۆژ

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: دەست پێشخەری نەکردن و پێش نەکەوتنەوە لە حوکم و بڕیاری خوای گەورە، ئەگەر کاتی ئەرك هات دوانەکەوی و بیانوو نەگری، خۆپاراستن لە ترسنۆکی و سیفەتی دووڕوویی و دەغەڵەکان.

٤. وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِنْ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَنْ يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ وَأُحْضِرَتِ الْأَنْفُسُ الشُّحَّ وَإِنْ تُحْسِنُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾

بەرهەمی تەقوا: سوڵح ژیانی ژن و مێرد بە سەرکەوتویی دەهێڵێتەوە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: پەنا بردن بۆ سوڵح چارەسەرێکی سەرەکیە بۆ پاراستنی خێزان لە هەڵوەشان، خۆگرتن لە چرووکی لەکاتی سوڵحدا بە تایبەت لە نێوان ژن و مێرد دا.

٥. وَلَنْ تَسْتَطِيعُوا أَنْ تَعْدِلُوا بَيْنَ النِّسَاءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ فَلَا تَمِيلُوا كُلَّ الْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَالْمُعَلَّقَةِ وَإِنْ تُصْلِحُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَحِيمًا ﴿١٢٩﴾

بەرهەمی تەقوا: سوڵح ڕێگایە بۆ لێ خۆشبوونی پەروەردگار.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ئەوەیە پیاوەکە سوڵح نەقۆزێتەوە بۆ ستەم کردن و وێڵکردنی یەکێکیان و ئەوی تر بگرێتە خۆی.

٦. وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ اتَّقُوا اللَّهَ وَإِنْ تَكْفُرُوا فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَكَانَ اللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾

بەرهەمی تەقوا: بەهرەمەند بوون لە وەسیەتی گەلانی پێشوو.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: دڵنیابوون لە دەسەڵات و خاوەنداریەتی پەروەردگار بۆ ئاسمانەکان و زەوی، خۆپاراستن لە بێ باوەڕی و سپڵەیی.

## سورەتی المائدە

١. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ وَلَا الشَّهْرَ الْحَرَامَ وَلَا الْهَدْيَ وَلَا الْقَلَائِدَ وَلَا آمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنْ رَبِّهِمْ وَرِضْوَانًا وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَنْ صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَنْ تَعْتَدُوا وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٢﴾

بەرهەمی تەقوا: پارێزران لە سزای سەختی پەروەردگار.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: نەشکاندنی سنوورەکانی خوا کە لەم دوو ئایەتە پیرۆزەدا باسیان کراوە، وەك وەفا بە پەیمان و بەڵێنەکان.

٢. يَسْأَلُونَكَ مَاذَا أُحِلَّ لَهُمْ قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ وَمَا عَلَّمْتُمْ مِنَ الْجَوَارِحِ مُكَلِّبِينَ تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ اللَّهُ فَكُلُوا مِمَّا أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ وَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ سَرِيعُ الْحِسَابِ ﴿٤﴾

بەرهەمی تەقوا: کار ئاسان بوو و وەڵام دانەوەی پەروەردگار بۆ بەندەکان.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: پرسیارکردن ڕێگایەکی گرنگە بۆ بەختەوەری و پارێزکاری، ناوی خوا بردن لە سەر هەر کارێکی گرنگ.

٣. وَاذْكُرُوا نِعْمَةَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمِيثَاقَهُ الَّذِي وَاثَقَكُمْ بِهِ إِذْ قُلْتُمْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ بِذَاتِ الصُّدُورِ ﴿٧﴾

بەرهەمی تەقوا: مسۆگەر کردنی پاداشتی خوا، ئەوە لەوە وەردەگیرێ کە خوای گەورە زانایە بەناو دڵەکان، کەواتە پارێزکاران پاداشتیان بە زایا ناچێ.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: بیرکردنەوە لە نیعمەتەکانی خوا، بیرکردنەوە لە پابەند بوون بە بەڵێنەکان، لەبیرمان بێ کە ئێمە بەڵێنی گوێڕایەڵی و مل کە چیمان بە خوای گەورە داوە.

٣. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَىٰ أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿٨﴾

بەرهەمی تەقوا: هەمان بەرهەمی پێشویە کە لە ئایەتەکەی تردا باسمان کرد.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: جێ بە جێ کردنی دادگەریە بە ئیجابی و سلبی. ئیجابی ئەرێنی ئەوەیە کە دادگەربین، سلبی نەرێنی ئەوەیە کە پێچەوانەی دادگەری هەنگاو نەنێین بە تایبەت لەبەر دۆستایەتی و خزمایەتی و بەرژەوەندی.

٤. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ هَمَّ قَوْمٌ أَنْ يَبْسُطُوا إِلَيْكُمْ أَيْدِيَهُمْ فَكَفَّ أَيْدِيَهُمْ عَنْكُمْ ۖ وَاتَّقُوا اللَّهَ ۚ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ﴿١١﴾

بەرهەمی تەقوا: زیادبوونی نیعمەتەکانی پەروەردگار چوونکە نیعمەتەکان بە باسکردن و شوکر کردن زیاد دەکەن.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: یادکردنەوەی چاکەکانی پەروەردگار کە لە دوژمنانی پاراست.

٥. وَاتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَيْ آدَمَ بِالْحَقِّ إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ الْآخَرِ قَالَ لَأَقْتُلَنَّكَ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ اللَّهُ مِنَ الْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾

بەرهەمی تەقوا: تەقوا هۆکاری گیرابونی چاکە و کردەوەکانە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: وەڵام دانەوەی خەراپە بە خەراپە نەدەیتەوە.

٦. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَابْتَغُوا إِلَيْهِ الْوَسِيلَةَ وَجَاهِدُوا فِي سَبِيلِهِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾

تەقواو وەسیلەی خێر بەرهەمەکەی (فلاح) سەربەرزییە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: بە دەستەوە گرتنی وەسیلە خێرەکان و تێکۆشان لە پێناوی خوا.

٧. وَقَفَّيْنَا عَلَى آثَارِهِمْ بِعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَآتَيْنَاهُ الْإِنْجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ التَّوْرَاةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾

بەرهەمی تەقوا: پەند و ئامۆژگاری وەرگرتن.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: تێگەیشتن لە پەیامی عیسا و موسا سەلامی خوایان لێبێ.

٨. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا الَّذِينَ اتَّخَذُوا دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَالْكُفَّارَ أَوْلِيَاءَ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴿٥٧﴾

بەرهەمی تەقوا: بەرهەمی تەقوا ئیمان پتەو بوونە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: وریا بین بێباوەران بە هەردوو جەبهەکەی لە سەنگەردان چ خاوەن کتابە ئاسمانیەکان، چ مولحیدو مادده پەرستەکان.

٩. وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْكِتَابِ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَكَفَّرْنَا عَنْهُمْ سَيِّئَاتِهِمْ وَلَأَدْخَلْنَاهُمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٦٥﴾

بەرهەمی تەقوا: تاوان ڕەشبوونەوە و چوونە بەهەشتە.

ڕێگای دەست خستنی تەقوا: ئیمان و ڕاست بون لەگەڵ پەیامی خوا.

١٠. وَكُلُوا مِمَّا رَزَقَكُمُ اللَّهُ حَلَالًا طَيِّبًا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿٨٨﴾

بەرهەمی تەقوا: پتەوبوونی ئیمانە.

ڕێگای بە دەست خستنی تەقوا: ڕزقی حەڵال خواردن.

١١. لَيْسَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ جُنَاحٌ فِيمَا طَعِمُوا إِذَا مَا اتَّقَوْا وَآمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ ثُمَّ اتَّقَوْا وَآمَنُوا ثُمَّ اتَّقَوْا وَأَحْسَنُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ ﴿٩٣﴾

بەرهەمی تەقوا: لەم ئایەتەدا سێ جار باسی تەقوا و ئیمان کراوە ئەوش بەڵگەی ئەوەیە تەقوا دوو سەرەیە، هەم هۆکاری بەهێز بوونی ئیمانە، هەم بەرهەمی ئیمانە.

ڕێگای دەست خستنی تەقوا: وازهێنان لە حەرام بەتایبەت مەی خواردنەوە.

١٢. أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَكُمْ وَلِلسَّيَّارَةِ وَحُرِّمَ عَلَيْكُمْ صَيْدُ الْبَرِّ مَا دُمْتُمْ حُرُمًا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩٦﴾

هەســـت کردن بە زینـدووبوونەوە و خۆئـامـادەکردن ڕێگـای تەقوایە. خوای گەورە ئەگەر لەکـاتی ئیحرام دا ڕاوی لە خەڵکی قەدەغە کردبا کە بە دەریـاکـانـدا دێن بۆ حەج و عمرە، تووشـــی ئەوپەڕی نارەحەتی دەبوون، ئەمەش لەگەڵ حیکمەتی تەشـریعی فراوانی ئیسلام نایەتەوە.

١٣. قُلْ لَا يَسْتَوِي الْخَبِيثُ وَالطَّيِّبُ وَلَوْ أَعْجَبَكَ كَثْرَةُ الْخَبِيثِ فَاتَّقُوا اللَّهَ يَا أُولِي الْأَلْبَابِ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٠٠﴾

بەرهەمی تەقوا سەرفرازی هەردوو دونیایە.

گەیشتن بەو سەرفرازیە ئەوەیە مسوڵمان پاك و پیس و خەراپ لەیەك جیابکاتەوە.

١٤. ذَلِكَ أَدْنَى أَنْ يَأْتُوا بِالشَّهَادَةِ عَلَى وَجْهِهَا أَوْ يَخَافُوا أَنْ تُرَدَّ أَيْمَانٌ بَعْدَ أَيْمَانِهِمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاسْمَعُوا وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ ﴿١٠٨﴾

بەرهەمی تەقوا: پاراستنی مافەکانە.

ڕێگای تەقوا: شایەتی دانی بەڕاستیە.

١٥. إِذْ قَالَ الْحَوَارِيُّونَ يَا عِيسَى ابْنَ مَرْيَمَ هَلْ يَسْتَطِيعُ رَبُّكَ أَنْ يُنَزِّلَ عَلَيْنَا مَائِدَةً مِنَ السَّمَاءِ قَالَ اتَّقُوا اللَّهَ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴿١١٢﴾

بەپێی وتەی عیسی سەلامی خوای لێبێ ئەوەیە داواکاری نابەجێ نەکەی.

ڕێگای تەقوا: ئەوەیە لە حیکمەتی شتەکان تێبگەی.

# سورەتی الانعام

١. وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا لَعِبٌ وَلَهْوٌ وَلَلدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٣٢﴾

بەرهەمی تەقوا: بردنەوەی دوواڕۆژە کە هۆکاری حەسا نەوەی یەکجاریە.

ڕێگای تەقوا: ئەوەیە لە حەقیقەتی دوونیا تێ بگەی.

٢. وَأَنْذِرْ بِهِ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْ يُحْشَرُوا إِلَى رَبِّهِمْ لَيْسَ لَهُمْ مِنْ دُونِهِ وَلِيٌّ وَلَا شَفِيعٌ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٥١﴾

ڕێگای بە تەقوا گەیشتن وریا کردنەوە و ترساندنە بە دوواڕۆژ.

٣. وَمَا عَلَى الَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَلَٰكِنْ ذِكْرَى لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٦٩﴾

ئەم ئایەتە دووشت فێری ئێمە دەکات:

یەك: نابێ مرۆڤی پارێزکار شانی گران بێ بە کەسانی ئیماندار.

دوو: سەبرگرتن لەگەڵ ئیمانداران بیرخستنەوە و تەقوامان بیر دەکات.

٤. وَأَنَّ هَٰذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَٰلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾

بەرهەم و ڕێگای تەقوا: وە دوو ڕێگای ڕاست بکەوین، پارچە پارچە نەبین، ئەم دوو شتە کە هەردووکی دوو دیوی یەك ڕاستین، بەرهەم و ڕێگای تەقوا.

ئەو ئایەتە پێمان دەفەرمووێ جیا جیایی نیشانەی بێ تەقواییە.

## سورەتی الاعراف

١. يَا بَنِي آدَمَ قَدْ أَنْزَلْنَا عَلَيْكُمْ لِبَاسًا يُوَارِي سَوْآتِكُمْ وَرِيشًا وَلِبَاسُ التَّقْوَى ذَلِكَ خَيْرٌ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿٢٦﴾

ئێمە دوو جۆر پۆشاکمان هەیە:

- پۆشاکی ماددی کە لاشەمان دادەپۆشێ هەم جوانە هەم عەیبمان دادەپۆشێ.
- پۆشاکی تەقوا کە ڕەوشتمان جوان دەکات و کەسایەتیمان دەپارێزێ.

٢. يَا بَنِي آدَمَ إِمَّا يَأْتِيَنَّكُمْ رُسُلٌ مِنْكُمْ يَقُصُّونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِي فَمَنِ اتَّقَى وَأَصْلَحَ فَلَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٣٥﴾

کەواتە تەقوا ئەوەیە: ئێمە بڕوامان هەبێ بە پەیامبەران، ئەمە ڕێگای ئیسلاح و تەقوایە، بەرهەمەکەشی بریتیە لە دووارۆژ، دوور دەبین لە خەم پەژارە و ترس چ لە ڕابردوو چ لە داهاتوو.

٣. أَوَعَجِبْتُمْ أَنْ جَاءَكُمْ ذِكْرٌ مِنْ رَبِّكُمْ عَلَى رَجُلٍ مِنْكُمْ لِيُنْذِرَكُمْ وَلِتَتَّقُوا وَلَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٦٣﴾

کەواتە هاتنی پەیام و پەیامبەران بۆ سێ شتە:

- وریا کردنەوە.
- پارێزگاری.
- کەوتنە بەر ڕەحمەتی خوا سبحانه و تعالی.

٤. وَإِلَى عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٦٥﴾

کەواتە بانگەوازی سەرەکی هود سەلامی خوای لەسەر بێ بۆ گەلەکەی ئەوە بووە کە پارێزکاربن، جالێرەدا بەرکارەکە(مفعول) نەوتراوە بۆ ئەوەی هەموو ئەو شتانە بگرێتەوە کە بۆی گوونجاوە، وەك تەقوا لە خوای گەورە، تەقوا لە گوناهەکان، تەقوا لە سزای دوونیا و دوواڕۆژ.

٥. وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾

تەقوا هۆکارە بۆ دابەزینی ڕەحمەتی پەروەردگار لە ئاسمان و زەوی، لەوانەیە یەکێك بڵێ چۆن؟

ئەگەر خەڵك بە تەقوا بن بەتایبەت بەرپرسان ستەم نەکەن ئەوە گوومان لەوە دانیە زەوی ئەوەندە دەوڵەمەندە چەند ئاپۆرای زیاتر بێ هێشتا زەوی زۆر دەوڵەمەندە، وە هەتا ئاسمان بێجگە لە بەرەکەتی مەعنەوی بەرەکەتی زەویش زیاد دەکات، ئەگەر خەڵك

ئەوەندە زیادە ڕەوی نەکات لە بەکارهێنانی گاز و سووتەمەنی گەرما قەتیس نابێ و ژینگە وێران نابێ و بارانیش کەم نابێ.

٦. قَالَ مُوسَى لِقَوْمِهِ اسْتَعِينُوا بِاللَّهِ وَاصْبِرُوا إِنَّ الْأَرْضَ لِلَّهِ يُورِثُهَا مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٨﴾

بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە بەختەوەری و چاکەی هەردوو دوونیا بۆ ئیمانداراندەبێ، موتەقی کێن؟

- ئەوانەن کە بڕوایان بە پێغەمبەرە و شوێنی دەکەون.
- بە گەورە و سەروەری خۆیانی دەزانن.
- یارمەتی دەدەن.
- شوێن نورەکەی دەکەون کە قورئانە.

بەرهەمەکەشی ڕزگاری یەکجاریە بە هۆی پێغەمبەر علیه الصلاه والسلام.

٨. وَإِذْ قَالَتْ أُمَّةٌ مِنْهُمْ لِمَ تَعِظُونَ قَوْمًا اللَّهُ مُهْلِكُهُمْ أَوْ مُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا شَدِيدًا قَالُوا مَعْذِرَةً إِلَى رَبِّكُمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿١٦٤﴾

کەواتە تەنیا پارێزکاران پەند لە ئامۆژگاری پەیامبەران و دڵ سۆزان وەر دەگرن، وە تەقوا هۆکاری ڕزگار بوونە لە سزا.

٩. فَخَلَفَ مِنْ بَعْدِهِمْ خَلْفٌ وَرِثُوا الْكِتَابَ يَأْخُذُونَ عَرَضَ هَذَا الْأَدْنَى وَيَقُولُونَ سَيُغْفَرُ لَنَا وَإِنْ يَأْتِهِمْ عَرَضٌ مِثْلُهُ يَأْخُذُوهُ أَلَمْ يُؤْخَذْ عَلَيْهِمْ مِيثَاقُ الْكِتَابِ أَنْ لَا يَقُولُوا عَلَى اللَّهِ إِلَّا الْحَقَّ وَدَرَسُوا مَا فِيهِ وَالدَّارُ الْآخِرَةُ خَيْرٌ لِلَّذِينَ يَتَّقُونَ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٦٩﴾

بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە دوواڕۆژ بۆ پارێزکارانە، وە بەڵێنیان لێ وەرگیراوە بەس ڕاستی بڵێن و دراسەی بکەن، وە نەبنە جێگرەوەیەکی خەراپ بۆ پێغەمبەران علیهم الصلاە والسلام، وە دین نەفرۆشن لەبەر دوونیا، بە هەموو ئەو شتانە دەڵێن تەقوا.

١٠. وَإِذْ نَتَقْنَا الْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُ ظُلَّةٌ وَظَنُّوا أَنَّهُ وَاقِعٌ بِهِمْ خُذُوا مَا آتَيْنَاكُمْ بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُوا مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٧١﴾

کەواتە دەست گرتن بە دینەوە بەڕێك و پێکی و بە چاکی، وە بیر لێکردنەوە و دیراسەکردنی هۆی ڕزگار بوونە لە سزای خوا.

١١. إِنَّ الَّذِينَ اتَّقَوْا إِذَا مَسَّهُمْ طَائِفٌ مِنَ الشَّيْطَانِ تَذَكَّرُوا فَإِذَا هُمْ مُبْصِرُونَ



تەقوا ئەو جیهازو وریا کەرەوەیە کە بەردەوام بڕوادار بە ئاگا دەهێنێتەوە، شەرت نیە پارێزکار هەڵەنەکا بەڵکوو بەئاگا دێتەوە و بەردەوام نابێ لەسەر هەڵەکە.

## سورەتی الانفال

١. يَسْأَلُونَكَ عَنِ الْأَنْفَالِ قُلِ الْأَنْفَالُ لِلَّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَصْلِحُوا ذَاتَ بَيْنِكُمْ وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ ﴿١﴾

پرسیار دەربارەی ئەو غەنیمەتەیە کە بەشەڕ گیراوە لە کافرەکان لە شەڕی بەدر، ئایا چۆن بەشی دەکەن؟ لێیان بوو بە مشتوومڕ خوای گەورە وەڵامی دانەوە بە باشتر لە هەمووشتێك ئەویش

حوكمی دابەشكردنەكەی لە دەستی خوا و پێغەمبەرەكەیدا، ئێوە لە جیاتی باسی دەسكەوتی جەنگ بكەن باشترە لەوە بۆ ئێوە تەقواو لە خواترسانە، چوونكە ئەگەر پارێزكاربن دین و دوونیاتان بۆ ئاسان دەبێ و كێشەی غەنیمە تیشتان بۆ ئاسان دەبێ و دوور لە ناكۆكی.

٢. وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٢٥﴾

خۆپاراستن لە ئاشووب و بەڵا، ڕێگایە بۆ خۆپاراستن لە سزای خوا كەواتە سزای خوا ئەگەر هات بەس ستەم كارەكان ناگرێتەوە، بەڵكوو ئەوەكانی تریش دەگرێتەوە. لە ئوممەتانی پێشوو ئەگەر سزایەك بهاتبا بەس ستەمكارانی دەگرتەوە بڕواداران ڕزگاریان دەبوو، بەڵام لە ئێستادا یاساكە گۆڕاوە دەبێ كەسە باشەكان ڕێگا لە خەراپەكارەكان بگرن بۆ ئەوەی هەموو بەر بەڵا نەكەون.

٣. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَتَّقُوا اللَّهَ يَجْعَلْ لَكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنْكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ ذُو الْفَضْلِ الْعَظِيمِ ﴿٢٩﴾

تەقوا هۆكارە بۆ بەرچاو ڕوونی و چاك و خەراپ لە یەك جیاكردنەوە، وە بۆ ئەوەی لە تاوانی گەورە و بچوكی پارێزكار ببەخشرێ، خوای گەورە هێشتا پێی دەڵێ ئەو خاوەن بەخششی گەورەیە.

٤. وَمَا لَهُمْ أَلَّا يُعَذِّبَهُمُ اللَّهُ وَهُمْ يَصُدُّونَ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ وَمَا كَانُوا أَوْلِيَاءَهُ إِنْ أَوْلِيَاؤُهُ إِلَّا الْمُتَّقُونَ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٤﴾

پارێزکاران تاقە کەسانێکن کە دەبن بە دۆست و نزیکی پەروەردگار، خوای گەورە بە شێوەی کورت هەڵێنان(حصر) هێناویەتی وە پارێزکاران لە هەرکەس شایەنترن بە ماڵی خوا کە کەعبەی پیرۆزە.

٥. الَّذِينَ عَاهَدْتَ مِنْهُمْ ثُمَّ يَنْقُضُونَ عَهْدَهُمْ فِي كُلِّ مَرَّةٍ وَهُمْ لَا يَتَّقُونَ ﴿٥٦﴾

نەپاراستنی بەڵێن و پەیمان بێ تەقواییە، کەواتە موتەقی خاوەنی بەڵێن و پەیمانی خۆیەتی.

٦. فَكُلُوا مِمَّا غَنِمْتُمْ حَلَالًا طَيِّبًا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿٦٩﴾

کەواتە خوای گەرە لەگەڵ ئەوانەی حەلاڵ خۆرو پارێزکارن، تاوان پۆش و بەبەزەییە.

## سورەتی التوبە

١. إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ لَمْ يَنْقُصُوكُمْ شَيْئًا وَلَمْ يُظَاهِرُوا عَلَيْكُمْ أَحَدًا فَأَتِمُّوا إِلَيْهِمْ عَهْدَهُمْ إِلَىٰ مُدَّتِهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ ﴿٤﴾

ئەو ئایەتە پێمان دەفەرمووێ دەبێ لەگەڵ هاوبەش پەرستانیش ئەهلی وەفا بین، وەفا ئەو ڕەوشتەیە کە هەموو مرۆڤایەتی

لەسەری کۆکە، هەتا ئەگەر ئاژەڵیش تێیدا نەبێ گلەیی لێدەکرێ، بۆ نمونە ئەگەر سەگێک نان بدەی چاوەڕوانی ناکەی بتگرێ و پێت بوەڕێ چوونکە پێچەوانەی وەفایە.

٢. كَيْفَ يَكُونُ لِلْمُشْرِكِينَ عَهْدٌ عِنْدَ اللَّهِ وَعِنْدَ رَسُولِهِ إِلَّا الَّذِينَ عَاهَدْتُمْ عِنْدَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ فَمَا اسْتَقَامُوا لَكُمْ فَاسْتَقِيمُوا لَهُمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَّقِينَ 

دوپاتی دەکاتەوە هەرچەند موشریکان کەمتر ئەهلی وەفان بەڵام ئەگەر پابەند بوون بە بەڵێنەکانیان ئێوەش پابەند بن، چوونکە پارێزکارار ئەهلی وەفایە.

**٣.** إِنَّ عِدَّةَ الشُّهُورِ عِنْدَ اللَّهِ اثْنَا عَشَرَ شَهْرًا فِي كِتَابِ اللَّهِ يَوْمَ خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ مِنْهَا أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ فَلَا تَظْلِمُوا فِيهِنَّ أَنْفُسَكُمْ وَقَاتِلُوا الْمُشْرِكِينَ كَافَّةً كَمَا يُقَاتِلُونَكُمْ كَافَّةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ 

پاراستنی مانگە قەدەغەکراوەکان و جەنگ تێدا نەکردنیان لەو لاشەوە وەڵامدانەوەی بت پەرستان و بەرچدانەوەی دەست درێژی کاران ئەو پەڕی تەوقوایە، وە هۆکارێکە بۆ یارمەتی و لەگەڵدابونی خوا بە یارمەتی دان.

٤. لَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ أَنْ يُجَاهِدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنْفُسِهِمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ 

کەسی موتەقی کە دەزانێ شێک فەرمانی خوایە خۆی نادزێتەوە و پرس ناکا و بیانوو ناهێنێتەوە و لە ئەرک ڕاناکات، وەك دوو ڕووەکان ناکات کە بەڕواڵەت پرس دەکەن بەڵام لە ڕاستیدا خۆیان دەشارنەوە و دەدزنەوە لە جیهاد لە خزمەتی پێغەمبەری خوا.

٥. لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا لَمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَنْ تَقُومَ فِيهِ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَنْ يَتَطَهَّرُوا وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾

کەواتە جیاوازی زۆرە لە نێوان ئەو کەسەی مزگەوت لە سەر بنچینەی تەقوا لە بەر خوا درووست دەکات، لەگەڵ ئەوەی مزگەوت دەکاتە بنکەی بێدینی و خۆتێدا مەڵزدان دژی بڕواداران، هەر ئەوەشە جیاوازی مزگەوتی پارێزکاران و مزگەوتی دەغەڵەکان و دوو ڕووەکان.

٦. فَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَى تَقْوَى مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَمْ مَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَى شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٩﴾

کەواتە مزگەوتێك لەسەر تەقوا دامەزراو دەبێ، بەڵام مزگەوتێك لەسەر ئەساسی بێ تەقوای دامەزراوبێ هەرەس دێنێ و خاوەنەکەی شۆڕ دەکاتەوە بۆ ئاگری دۆزەخ.

٧. وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُضِلَّ قَوْمًا بَعْدَ إِذْ هَدَاهُمْ حَتَّى يُبَيِّنَ لَهُمْ مَا يَتَّقُونَ إِنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ ﴿١١٥﴾

کەواتە ئەگەر مرۆڤ هیدایەت درا خوای گەورە ئەوەندە ڕێگای بۆ ڕوون دەکاتەوە تا ببێتە پارێزکار و تاوانەکان بناسێ.

٨. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَكُونُوا مَعَ الصَّادِقِينَ ﴿١١٩﴾

تەقوای ڕاستەقینە ئەوەیە لەگەڵ ڕاستی و ڕاستان دابی.

٩. يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قَاتِلُوا الَّذِينَ يَلُونَكُمْ مِنَ الْكُفَّارِ وَلْيَجِدُوا فِيكُمْ غِلْظَةً وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ مَعَ الْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾

توندی لەگەڵ کافرانی ئەهلی شەر دژی دووژمنان ئەوپەڕی تەقوایە و هۆکاری یارمەتی دانی پەروەردگار و لەگەڵدا بەنیەتی بۆ بەندەکەی.

## سورەتی یونس

١. إِنَّ فِي اخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾

وردبوونەوە لە درووست کراوەکانی خوای گەورە، وەك درووست کرانی ئاسمانەکان و زەوی، وە شەو و ڕۆژ، ڕێگای گەیشتن بە تەقوایە.

٢. قُلْ مَنْ يَرْزُقُكُمْ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ أَمَّنْ يَمْلِكُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَمَنْ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَنْ يُدَبِّرُ الْأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللَّهُ فَقُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣١﴾

ئەگەر کەسێك دانبنێ بەوەدا کە خوای گەورە خاوەنی بوونەوەرە وە خاوەنی بیستن و بینینەکانە، وە زیندوو لە مردوو درووست دەکات وە مردوو لە زیندوو دەر دەکات، وە هەمووکارەکان بەڕێوە دەبا، هیچ پاساوێك نیە بۆ حساب بۆ نەکردن و لێی نەترسان، کەواتە زانیاری بەو شتانە بەرەو تەقوامان دەبا.

٣. لَا إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦٢﴾ الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿٦٣﴾ لَهُمُ الْبُشْرَى فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَفِي الْآخِرَةِ لَا تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللَّهِ ذَلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٦٤﴾

ئیمان و تەقوا ڕێگایە بۆ گەیشتن بە وەلی بوون، کەسێ ببێ بە وەلی خوا لە دینوو دوونیا بەختەوەر دەبێ.

بەرهەمەکەشی ئەوەیە کە خوای گەورە مزگێنی زۆری پێ دەدا و لە دوونیا و دواڕۆژ، لەوانەش خەونی خۆش.

## سورەتی هود

١. تِلْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الْغَيْبِ نُوحِيهَا إِلَيْكَ مَا كُنْتَ تَعْلَمُهَا أَنْتَ وَلَا قَوْمُكَ مِنْ قَبْلِ هَذَا فَاصْبِرْ إِنَّ الْعَاقِبَةَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٩﴾

لێکۆڵینەوە لە مێژوو پەند وەرگرتن ڕێگایە بۆ تەقوا، هەر وەك سەرنجام داهاتوی دووروو نزیك بۆ تەقوا کارانە.

**٢.** وَجَاءَهُ قَوْمُهُ يُهْرَعُونَ إِلَيْهِ وَمِنْ قَبْلُ كَانُوا يَعْمَلُونَ السَّيِّئَاتِ قَالَ يَا قَوْمِ هَؤُلَاءِ بَنَاتِي هُنَّ أَطْهَرُ لَكُمْ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ فِي ضَيْفِي أَلَيْسَ مِنْكُمْ رَجُلٌ رَشِيدٌ ﴿٧٨﴾

هەنگاو نان بۆ ڕەوشت نزمی لەگەڵ ڕێبازی تەقوا ڕێك ناكەوێ، كەواتە تەقوا ڕەوشت بەرزی دوورە لە لادانی جنسی، وە دوورە لە بێ ڕێزی بە میوان، ئیحراج كردنی خاوەن میوان.

## سورەتی یوسف

**١.** وَلَأَجْرُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ لِلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿٥٧﴾

ئەوەی كە یوسف پێی گەیشت سەلامی خوای لێبێ بەرهەمی تەقوا بوو، وە ئەو بەڕێگای تەقوا كاران دا ڕۆیشت، چۆن لە دوونیا گەیشت بە لوتكەی دەسەڵات، بێگوومان دووارۆژ بۆ تەقواكاران باشترە.

٢. قَالُوا أَإِنَّكَ لَأَنْتَ يُوسُفُ قَالَ أَنَا يُوسُفُ وَهَذَا أَخِي قَدْ مَنَّ اللَّهُ عَلَيْنَا إِنَّهُ مَنْ يَتَّقِ وَيَصْبِرْ فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِينَ ﴿٩٠﴾

تەقوا ڕێگایە بۆ پلەی ئیحسان و چاكەكاری كە لوتكەی بەندایەتیە، وە بەرهەمەكەشی گەیشتنەوە و شادبونەوەیە بە ئازیزان وەك بۆ یوسف و یەعقوب و براكەی وەدی هات سەلامی خوایان لێ بێ.

## سورەتی الرعد

مَثَلُ الْجَنَّةِ الَّتِي وُعِدَ الْمُتَّقُونَ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ أُكُلُهَا دَائِمٌ وَظِلُّهَا تِلْكَ عُقْبَى الَّذِينَ اتَّقَوْا وَعُقْبَى الْكَافِرِينَ النَّارُ ﴿٣٥﴾

تەقواکاران بەڵێنی بەهەشتانێکیان پێ دراوە کە لە ژێریان دا چەندین ڕووباری جۆراو جۆر دەروا وە هەمووشی بێ کۆتایە و بەردەوامە.

## سورەتی حجر

١. إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ادْخُلُوهَا بِسَلَامٍ آمِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْوَانًا عَلَى سُرُرٍ مُتَقَابِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُمْ مِنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴿٤٨﴾

بەرهەمی تەقوا:

- چونە بەهەشتی پڕ نازو نیعمەت.
- پڕ کانی و ڕووبار و باخ و باخات.
- دڵنیابوون و خۆشنوودی.
- گەیشتن بە ئازیزان و خۆشەویستان لەسەر قەنەفە و پشتی بەرز و بڵند، لە هەمووشی خۆشتر ئەوەیە کۆتای بەم ژیانە نایا و دەرچن نیە.

٢. قَالَ إِنَّ هَؤُلَاءِ ضَيْفِي فَلَا تَفْضَحُونِ (68) وَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ (69)

تەقوا واتە: ڕێزگرتنی میوان و قوربانی دان لە پاراستنی شۆی میوان، دیارە قەومی(لوط) نێربازبوون و توشی لادانی جنسی بوون، میواناکان لە شێوەی پیاو هاتوون بۆ ماڵەکەی ویستویانە دەست درێژیان بۆ سەر بکەن بۆیە(لوت) زۆر توشی ئیحراجی بووە.

## سورەتی النحل

**١.** يُنَزِّلُ الْمَلَائِكَةَ بِالرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِ عَلَىٰ مَنْ يَشَاءُ مِنْ عِبَادِهِ أَنْ أَنْذِرُوا أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا أَنَا فَاتَّقُونِ ﴿٢﴾

کەواتە ڕێگای تەقوا ئەم قورئانە پیرۆزەیە کە خوای گەورە لە ڕێی فریشتەکانەوە ناردویەتی بۆ پێغەمبەران علیهم الصلاه والسلام، وە فریشتەکانیش ڕوحن.

**٢.** وَقِيلَ لِلَّذِينَ اتَّقَوْا مَاذَا أَنْزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوا خَيْرًا لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَٰذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَلَدَارُ الْآخِرَةِ خَيْرٌ وَلَنِعْمَ دَارُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّاتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَاءُونَ كَذَٰلِكَ يَجْزِي اللَّهُ الْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلَامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾

- تەقواکاران هەرشتێکیان لە خواوە بۆ بێ بەگەورە و بەرز و خێر سەیری دەکەن.
- وە ژیانی دوونیاشیان سەربەرزانەیە.

- وە لە دوواڕۆژیشدا خاوەنی باشترین جێگە و ماڵن.
- وە گیان کێشانیشیان بە موژدە و ڕەزامەندی خوای خۆیان دەبێ.
- وە فریشتەکان هاورێیان دەبن لە دوونیا و سەرەمەرگ و دوواڕۆژ.

٣. وَلَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَهُ الدِّينُ وَاصِبًا أَفَغَيْرَ اللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾

کەواتە مرۆڤ کە دەزانێ هەموو بونەوەر مل کەچی خوایە چۆن بۆ غیری خوا مل کەچ و زەلیل دەبێ!.

٤. وَاللَّهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمَّا خَلَقَ ظِلَالًا وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبَالِ أَكْنَانًا وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ وَسَرَابِيلَ تَقِيكُمْ بَأْسَكُمْ كَذَلِكَ يُتِمُّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تُسْلِمُونَ ﴿٨١﴾

چۆن تەقوا بە مانای خۆپاراستن دێ لە گوناه، لێرەش تەقوا خۆپاراستنە بەڵام بۆ شتی تر نەوەك گوناه، بەو پۆشاك و جلانە دەوترێ کە مرۆڤ دەپارێزێ لە شەڕو سەرما و گەرما وە ئەمانە لە نیعمەتەکانی پەروەردگارن وە بۆ ئەوەیە ئێمە بە مولك و بەهرەی خوایان بزانین و مل کەچ و گوێڕایەڵی پەروەردگار بین.

٥. إِنَّ اللَّهَ مَعَ الَّذِينَ اتَّقَوْا وَالَّذِينَ هُمْ مُحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾

ئەوە گەورەترین نیعمەتە کە مسوڵمان بە هۆی تەقوا، خوای گەورە دەبێتە یار و یاوەری وە دەبێتە هاوڕێی چاکەکاران (محسنين).

ئەم پلە باڵایەش بەم کارانە پێی دەگەی کە لە ئایەتەکانی پێشووتر هاتووە وەك:

- بانگەوازی(دەعوە)
- تۆڵە ساندنەوە بێ زیادە ڕەوی، باشتر لەوە لێبوردنە لەو کەسە.
- سەبروو خۆڕاگری بە هۆی خواو لەبەر خوا.
- خەم نەخواردن و خۆ پەك نەخستن بە هۆی دووژمنان.
- کارکردنی بەردەوام وریابوون نەترسان لە فێڵ و پلانی دووژمنان.

## سورەتی مریم

١. وَحَنَانًا مِنْ لَدُنَّا وَزَكَاةً وَكَانَ تَقِيًّا ﴿١٣﴾

یەکێك لە سیفەتە گەورە و تایبەتیەکانی یەحیا سەلامی خوای لێبێ تەقوایە، تەقوا سیفەتی ئەو منداڵەیە کە زەکەریا داوای کردووە، وە خوای گەورە بەتایبەت پێی بەخشیوە.

٢. قَالَتْ إِنِّي أَعُوذُ بِالرَّحْمَنِ مِنْكَ إِنْ كُنْتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾

تەقوا گەورەترین ڕێگرە لەبەر دەم خەراپەکاری، هەر بۆیە مەریەم کە ویستی بەرامبەر دوورخاتەوە لە خۆی کە وای زانی گەنجێکەو بۆ خەراپە هاتووە، تەقوای بیر خستەوە.

٣. تِلْكَ الْجَنَّةُ الَّتِي نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَنْ كَانَ تَقِيًّا ﴿٦٣﴾

تەقوا ئەم ڕەفتارە گەورە و پەسندەیە کە مرۆڤی مسوڵمان دەکاتە میرات گری بەهەشت.

٤. ثُمَّ نُنَجِّي الَّذِينَ اتَّقَوْا وَنَذَرُ الظَّالِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾

کەواتە ئەوەی کە مرۆڤ ڕزگار دەکات لە دۆزەخ کە هەمووکەس بەسەریدا ڕادەبرێ تەقوایە.

٥. يَوْمَ نَحْشُرُ الْمُتَّقِينَ إِلَى الرَّحْمَنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾

تەقواکاران لە دوواڕۆژدا لەم کات و ساتە ناڕەحەتانە کە بەرەو بانگ کەرەکە دەڕۆن و دەکەون و هەڵدەستنەوە لە تاریکیدا سەرگەردانن، ئەوان وەکوو وەفد و نێرراو و سەفیری وڵاتان بە رەو پەروەردگاری خۆیان دەڕۆن.

٦. فَإِنَّمَا يَسَّرْنَاهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ الْمُتَّقِينَ وَتُنْذِرَ بِهِ قَوْمًا لُدًّا ﴿٩٧﴾

مزگێنی ڕەها دراوە بە پارێزکاران، کە ئەم جۆرە مزگێنیە هەمووشتێك دەگرێتەوە.

## سورەتی طه

١. وَكَذَلِكَ أَنْزَلْنَاهُ قُرْآنًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ الْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾

کەواتە قورئانی پیرۆز کە دابەزیوە و ڕوونکراوەتەوە بۆ ئەوەیە تەقوا بەدی بێنێ و خەڵك بێدارکاتەوە ڕووداو درووست بکات.

**٢.** وَأْمُرْ أَهْلَكَ بِالصَّلَاةِ وَاصْطَبِرْ عَلَيْهَا لَا نَسْأَلُكَ رِزْقًا نَّحْنُ نَرْزُقُكَ وَالْعَاقِبَةُ لِلتَّقْوَى ﴿١٣٢﴾

نوێژ و سەبر لە سەر نوێژ چاکترین ڕێگایە بۆ تەقواکاری وە سەرنجام و داهاتووش بۆ پارێزکارانە، لە کاتێکدا هەمووکەس هەوڵدەدا بۆ مسۆگەرکردنی دواڕۆژی، بەتایبەت هەوڵدان لەگەڵ ماڵ و منالی کە ئەهلی نوێژبن.

## سورەتی الانبیا

وَلَقَدْ آتَيْنَا مُوسَى وَهَارُونَ الْفُرْقَانَ وَضِيَاءً وَذِكْرًا لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ بِالْغَيْبِ وَهُمْ مِنَ السَّاعَةِ مُشْفِقُونَ ﴿٤٩﴾

کتابەکانی خوا هۆکاری تەقواکاری و بیرخستنەوەن، کە کتابەکانی خوا جیاکەرەوەی ڕاستی و ناڕاستین لە یەکتر ڕووناکین بۆ ڕێگای ڕزگاری لە دونیا و دوواڕۆژ، مایەی گەورەی و شکۆن بۆ دین و دوونیا وە یادخەرەوە و ئامۆژگارین.

## سورەتی الحج

١. يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ إِنَّ زَلْزَلَةَ السَّاعَةِ شَيْءٌ عَظِيمٌ ﴿١﴾ يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّا أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى النَّاسَ سُكَارَى وَمَا هُمْ بِسُكَارَى وَلَكِنَّ عَذَابَ اللَّهِ شَدِيدٌ ﴿٢﴾

لێرەدا تەقوا لە پەروەردگار ترسان و خۆئامادە کردنە لەو ڕۆژەی کە زۆر ترسناك و ئەستەمە کە مەترسی ڕووداوەکە هەمووشت دادەگرێ، دایك کە لە دوونیا خۆی دەکاتە قوربانی کۆرپەکەی بەڵام لەو کاتەدا لێی بێئاگا دەبێ، بەردار بەرەکی دادەنێ و لەبار دەچێ، خەڵك مەست و سەرخۆش دەردەکەون وەك ئەوەی مەیان خواردبێتەوە بەڵام لەڕاستیدا بابەتەکە ئەوە نیە بەڵکوو ناڕەحەتی دوواڕۆژ مەست و سەرخۆشی کردوون.

٢. ذَلِكَ وَمَنْ يُعَظِّمْ شَعَائِرَ اللَّهِ فَإِنَّهَا مِنْ تَقْوَى الْقُلُوبِ ﴿٣٢﴾ نیشانەی تەقوا و بەرهەمی تەقوا بە گەورە گرتنی دروشمەکانی پەروەردگارە، کەواتە پێچەوانەکەش ڕاستە، کەسێك دروشمەکانی خوا بە گەورە نەگرێ تەقوا کار نیە.

٣. لَنْ يَنَالَ اللَّهَ لُحُومُهَا وَلَا دِمَاؤُهَا وَلَكِنْ يَنَالُهُ التَّقْوَى مِنْكُمْ كَذَلِكَ سَخَّرَهَا لَكُمْ لِتُكَبِّرُوا اللَّهَ عَلَى مَا هَدَاكُمْ وَبَشِّرِ الْمُحْسِنِينَ ﴿٣٧﴾

تەقوا لێرەدا ئیخلاص و خۆ یەکلاکردنەوەیە بۆ خوا، ئەو قووربانیانەی کە دەکرێن و دەدرێن بە هەژاران، ئەوەی کە دەگات

بە خوا ئیخلاسەکەیە، چوونکە ئەگەر بۆ خوا بێ منەتی تێدا نابێ و ئازاردانی تێدا نابێ بەردەوام دەبێ لە کاتی وا پێی نادا بە خۆیدا بشکێتەوە، دەزانێ خاوەنی حەقیقی ئەم نیعمەتە خوایە، ئەم بەخشینەش هەر لە چاکەی خوا دەزانێ، وە ڕێگایەکە بۆ شوکر.

## سورەتی المؤمنون

١. وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَى قَوْمِهِ فَقَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾

نوح سەلامی خوای لێبێ هەموو پەیامەکەی بە کورتی لە دوو خاڵدا کورت کردۆتەوە:

- (تەوحید) یەکتا پەرستی
- تەقوا

٢. وَإِنَّ هَذِهِ أُمَّتُكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَأَنَا رَبُّكُمْ فَاتَّقُونِ ﴿٥٢﴾ فَتَقَطَّعُوا أَمْرَهُمْ بَيْنَهُمْ زُبُرًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٥٣﴾

پارێزگاری لە وەحدەتی ئومەت، خوا پەرستی بە تەقوا کاری دەکرێ ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕاستەوخۆ ڕێمایمان دەکات بۆ تەقوا، کەواتە لە بێ تەقوایدا پارچە پارچە بوون، هۆکاری پارچە پارچە بوون بێ تەقواییە نە وەك شتی تر، وە دەفەرموێ:

وَأَنَّ هَذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيمًا فَاتَّبِعُوهُ وَلَا تَتَّبِعُوا السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَنْ سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ ﴿١٥٣﴾

**٣.** قُلْ مَنْ رَبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ قُلْ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٨٧﴾

کەسێك دان بنێ بە خوایەتی خوا دەبێ بە پێی توانا پارێزکاری لێ بکا. ئەگەر تەنها زانین بێ و هەڵوێست و کرداری لەگەڵ نەبێ سوودی نابێ شەیتان دانی دەنا:

- بە خالقیەتی خوا.
- بە ڕۆژی دووایی.
- بە ناو و سیفەتی خوا، بەڵام هیچ سوودی بۆی نەبوو چوونکە تەقواو مل کەچی نەبوو.

## سورەتی النور

١. وَلَقَدْ أَنْزَلْنَا إِلَيْكُمْ آيَاتٍ مُبَيِّنَاتٍ وَمَثَلًا مِنَ الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلِكُمْ وَمَوْعِظَةً لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٤﴾

ئەوانەی بەهرەمەندن لە نیشانە و بەڵگەکانی پەروەردگار، تەنها پارێزکاران.

**٢.** وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَخْشَ اللَّهَ وَيَتَّقْهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴿٥٢﴾

تەقوا ڕێگای سەرکەوتن و سەرفرازیە هاوکات لەگەڵ گوێڕایەڵی و لە خوا ترسان.

## سورەتی الفرقان

١. وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا ﴿٧٤﴾

کەسێك پێشەوایەتی تەقواکاران داوا بکات، دەبێ بۆخۆی (أتقى) بێ واتە پارێزکارترین بێ، وە خوای گەورە فێرمان دەکات نزا بکەین بۆ پێشەنگ بوونی پارێزکاران وە ئەو نزایە لە زمنی ئەو خەسڵەتانە دایە کە پێی دەبێ بە(عباد الرحمن).

## سورەتی الشعرا

١. وَإِذْ نَادَى رَبُّكَ مُوسَى أَنِ ائْتِ الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠﴾قَوْمَ فِرْعَوْنَ أَلَا يَتَّقُونَ ﴿١١﴾

کەواتە ئەگەر فرعەون ئالی فرعەون تەقوا کاربان هەرگیز ئەو هەموو تاوانەیان ئەنجام نەدەدا کە دەرهەق بە موسا و قەومی بەنو ئیسرائیل کردیان.

٢. وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٩٠﴾

بەهەشتی خوا بۆ ئەو کەسە دەڕازێنرێتەوە و دەهێنرێ کە پارێزکارە.

٣. إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾

دەبینیب لەم پێنج ئایەتە سێ جار وشەی تەقوا دووبارە بۆتەوە، یەکەم فەرمانی نوح سەلامی خوای لێبێ بە قەومەکەی یەکتاپەرستی و تەقوا بووە، وە پێش ئەوەی فەرمانیان پێ بکا بە گوێڕایەڵی هەمان فەرمان دووبارە دەکاتەوە، لە دوای ئەوەی کە دڵنییایان دەکاتەوە کە داوای هیچ کرێیەکیان لێ ناکت لە بەرامبەر بانگەوازەکەی دیسان داوایان لێ دەکا کەوا پارێزگار بن، ئایا ئەگەر تەقوا ئەوەندە گرنگ نەبێ پێویست بەو هەموو پێ داگیریە دەکا لە لایەن ئەو پێغەمبەرە دڵسۆز و باوکی دووەمی مرۆڤایەتیە؟.

گەلی نوح وێڕای بێ باوەڕی، چەوساندنەوەی چینایەتی زۆر بووە ئەوەی کە ئەوان  ناویان لێ ناون ( أراذل-بادي الرأي) پایە نزم، فام کاڵ، هەرکەسێ خۆی پێ لەخەڵك باڵاتر بێ پێی ئاساییە کە ستەمیان لێ بکا بۆیە ئەگەر پارێزکار بان ئەوە ڕووی نەدەدا.

٤. كَذَّبَتْ عَادٌ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ

لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُمْ بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُمْ بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾

لەگەڵ هودا سەلامی خوای لێبێ چوار جار وشەی تەقوا دووبارە بۆتەوە، دوویان وەك ئەوەی نوحە سەلامی خوای لێبێ وە دوویان بۆ وریاکردنەوەیە لە ڕەفتارە نەشیاوانە کە دەیان کرد بەرامبەر بڕوواداروو کەم دەستەکان کە ئێستاشی لەگەڵدابێ گرفتی گەورەی مرۆڤایەتییە.

لە ڕەوشتە ناشیرنەکانی گەلی هود ئەمانە بوون:

- بەڕاست دانەنای پێغەمبەرەکەیان.
- گاڵتە کردن بە خەڵکی هەژار.
- درووست کردنی کۆشك و باڵەخانەکان لە سەر ڕێگاکان بۆ گاکتەکردن و بێزار کردنی کەم دەرامەتەکان.
- لێدانی توووند بە ئێش بە ناحەق لە خەڵك.
- بێ منەتییان لە سزای خوا.

گومان لەوە دانییە ئەگەر پارێزکار بان خاوەنی ئەو لووت بەرزی و چەوسانەوە نەدەبوون.

٥. إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَالِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِي مَا هَاهُنَا آمِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِي جَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا

هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾

دیارە گەلی سەمود کە پێغەمبەکەیان سالح بووە هەمان هەڵوێستی ناشیرنی گەلانی پێشووتریان هەبووە، وە خاوەنی هێزوو توانا و نیعمەت گەلێکی زۆربوون، وە موعجیزەی خوای گەورەیان بینی کە وشترە گەورەکە بوو، لە جیاتی شوکری خوا پەلیان دا، وە لەناو ئەوان دا موترف و موسریفەکان دەست ڕۆیشتوو بوون بۆیە ئەوانیش دوواڕۆژیان بە سزا کۆتای پێ هات، ئەمەش سەرنجامی بێ تەقواییە.

٦. إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٦١﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٦٢﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٦٣﴾ وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٤﴾ أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ ﴿١٦٥﴾وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ ﴿١٦٦﴾ قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ ﴿١٦٧﴾ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ الْقَالِينَ ﴿١٦٨﴾ رَبِّ نَجِّنِي وَأَهْلِي مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ فَنَجَّيْنَاهُ وَأَهْلَهُ أَجْمَعِينَ ﴿١٧٠﴾ إِلَّا عَجُوزًا فِي الْغَابِرِينَ ﴿١٧١﴾ ثُمَّ دَمَّرْنَا الْآخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ مَطَرًا فَسَاءَ مَطَرُ الْمُنْذَرِينَ ﴿١٧٣﴾

گەلی لوت پێغەمبەر سەلامی خوای لێبێ کە تووشی لادانی جنسی ببوون نێربازیان کردبوو بە پیشە لە ڕێگای شەرعی و فیتری لایان دابوو توشی سزای خوای گەورە بوون، تەنیا دوو کچەکانی بڕوایان پێ هێنا تەنانەت خێزانەکەشی بڕوای پێ نەهێنا بێ گوومان ئەوەی کردیان و بەسەریان هات بەرهەمی بێ تەقوای بوو.

٧. كَذَّبَ أَصْحَابُ الْأَيْكَةِ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٧٦﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ شُعَيْبٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٧٧﴾ إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٧٨﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٧٨﴾وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَى رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿١٨٠﴾ أَوْفُوا الْكَيْلَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُخْسِرِينَ ﴿١٨١﴾ وَزِنُوا بِالْقِسْطَاسِ الْمُسْتَقِيمِ ﴿١٨٢﴾ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا فِي الْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿١٨٣﴾وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْأَوَّلِينَ ﴿١٨٤﴾

دیارە گەلی شوعەیب پێغەمبەر سەلامی خوای لێبێ تووشی فێڵ کردن ببوون لە کێشانە و پێوانە و بواری ئابووری، ئەم پێغەمبەرە لەم ژمارە کەمە لە ئایەتەکان سێ جار باسی تەقوایان لە گەڵ دەکات، بێگوومان گەندەڵی و بێ ویژدانی لە بواری ئابووری کێشەی هەرە گەورەی ئەمڕۆی جیهانە بە ڕابەرایەتی گاوروو جوو مولحیدەکان و مسوڵمانە بەتاڵ و دۆڕاو و خۆفرۆشەکان، کە لەمڕۆدا ٦/١ مرۆڤایەتی لە برسیایەتیدا دەژی، ئەمە لەبەر نەبوونی دارایی نیە بەڵکوو لەبەر نەبوونی دین و ویژدان و دادپەروەریە، بۆیە ئەوان بە سزای دوونیای خوا سوتان بێجگە لە دوواڕۆژ هەروەك چۆن لە دوونیادا خەك بە ئاگری ستەمی ئەوان سوتاوە.

## سورەتی النمل

وَأَنْجَيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿٥٣﴾

لەناو ئاپۆڕای گەلی (سەمود) تەنیا پارێزکاران ڕزگاریان بوو کاتێك سزای پەروەردگار هات، کەواتە تەقوای ڕێگای ڕزگارییە لە سزای تایبەتی و گشتی.

## سورەتی القصص

تِلْكَ الدَّارُ الْآخِرَةُ نَجْعَلُهَا لِلَّذِينَ لَا يُرِيدُونَ عُلُوًّا فِي الْأَرْضِ وَلَا فَسَادًا وَالْعَاقِبَةُ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٨٣﴾

بە پێی ئایەتە پیرۆزەکە دەرنجام و داهاتووی دین و دوونیا بۆ تەقوا کارانە، وە ڕێگای گەیشتن بە تەقوا ئەوەیە کە مرۆڤ خۆ بە بەرز نەزانێ و خۆی فەرز نەکا، وە لە زەویدا ئاشوب و ئاژاوە نەنێتەوە.

## سورەتی العنكبوت

وَإِبْرَاهِيمَ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاتَّقُوهُ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿١٦﴾

وەسیەتی ئیبراهیم بۆ گەلەکەی بەندایەتی کردنی پەروەردگارە، وە پارێزکاریە، وە پێیان دەفەرمووێ ئەم دوو وەسیەتە باشترین شتێکن بۆ ئەوان.

## سورەتی الروم

فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا فِطْرَتَ اللَّهِ الَّتِي فَطَرَ النَّاسَ عَلَيْهَا لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ اللَّهِ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾ مُنِيبِينَ إِلَيْهِ وَاتَّقُوهُ وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَلَا تَكُونُوا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ﴿٣١﴾ مِنَ الَّذِينَ فَرَّقُوا دِينَهُمْ وَكَانُوا شِيَعًا كُلُّ حِزْبٍ بِمَا لَدَيْهِمْ فَرِحُونَ ﴿٣٢﴾

مرۆڤ فەرمانی پێکراوە بەڕاست و درووستی ڕووی لە دین بێ، ئەم دینە ڕاست و ڕاستەقینە لە ناخی مرۆڤدا چێنراوە، ڕێگای بەردەوام بوون لەسەری تەوبەکردن، پارێزکاری، نەچوونە ناو ڕیز و پێری هاوبەش پەرستەکان.

## سورەتی لقمان

يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمْ وَاخْشَوْا يَوْمًا لَا يَجْزِي وَالِدٌ عَنْ وَلَدِهِ وَلَا مَوْلُودٌ هُوَ جَازٍ عَنْ وَالِدِهِ شَيْئًا إِنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُمْ بِاللَّهِ الْغَرُورُ ﴿٣٣﴾

بە پێی ئەم ئایەتە پیرۆزە چوار شت زەمانی ڕزگاربوونە لە دوواڕۆژ:

- تەقوا لە خوای پەروەردگار.
- ترسان لە ڕۆژی دووای.
- فریو نەخواردن بە فریو دەرەکان لە سەروویانەوە شەیتان.

## سورەتی الاحزاب

١. يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ اتَّقِ اللَّهَ وَلَا تُطِعِ الْكَافِرِينَ وَالْمُنَافِقِينَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١﴾وَاتَّبِعْ مَا يُوحَى إِلَيْكَ مِنْ رَبِّكَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿٢﴾ وَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ وَكَفَى بِاللَّهِ وَكِيلًا ﴿٣﴾

لە نێوان ئەم چوار فەرمانە سەرەکیەیی خوا بۆ پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم یەکەم فەرمان تەقوایە ئەگەر تەقوا گرنگ نەبێ نابێتە یەکەم فەرمانی خوا.

**٢.** يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَعْرُوفًا ﴿٣٢﴾

لێرەدا خێزانەکانی پێغەمبەر لەبەر ئەوەی پێگەیەکی گرنگی دین و دوونیاییان هەیە خوای پەروەردگار فەرمانیان پێ دەکا بە تەقوا.

ئەم فەرمان بە تەقوایە دوو واتای هەیە:

- (إِنِ اتَّقَيْتُنَّ) ئەگەر وڵامەکەی تەرك کرابێ ئەوە واتاکەی ئاوای لێ دێ، واتە ئەگەر ئێوە تەقواتان هەبێ وەك هیچ کام لە خەڵکان نین بەڵکوو لەهەمموو کەس گەورەترن، دیارە ئەم پلە و پایە گەورەیە تەنیا یەك ڕێگای هەیە ئەویش تەقوایە.
- ئەگەر واتاکەی پەیوەست بێ بە دوای خۆیەوەیە مانای وایە موتەقی دەنگی خۆی ناسك و نەرم نەکا و ناز و نوز نانوێنێ لەکاتی گفت و گۆ لەگەڵ پیاوانی نامەحرەم.

کەواتە تەقوا هەم پلە و پایە بەرز دەکاتەوە، هەم ڕێگا لە تاوان دەگرێ.

**٣.** وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَاكَهَا لِكَيْ لَا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَرًا وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا ﴿٣٧﴾ مَا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ سُنَّةَ اللَّهِ فِي الَّذِينَ خَلَوْا مِنْ قَبْلُ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ قَدَرًا مَقْدُورًا ﴿٣٨﴾

کەواتە دەبێ لەگەڵ خێزانەکەی هەمیشە لە خوا بترسێ، وە نابێ چاوی لە ستەم بێ، ئەمە وەسیەتی پێغەمبەر بووە علیه الصلاه والسلام بە زەید لەگەڵ زەینەب.

**٤.** لَا جُنَاحَ عَلَيْهِنَّ فِي آبَائِهِنَّ وَلَا أَبْنَائِهِنَّ وَلَا إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ إِخْوَانِهِنَّ وَلَا أَبْنَاءِ أَخَوَاتِهِنَّ وَلَا نِسَائِهِنَّ وَلَا مَا مَلَكَتْ أَيْمَانُهُنَّ وَاتَّقِينَ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴿٥٥﴾

ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوە دەگەیەنێ کە دەبێ لەگەڵ مەحرەمەکان بە وریایی هەڵس و کەوت بکەین، نە وشکی بنووێنین، نە زیادەڕەوی بکەین لە تێکەڵاو بووندا.

**٥.** يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾

کەواتە تەقوا قسەی باش بەرهەمەکەی کاروبار چاك بوون و سازانی دوونیایە، وە بەخشرانی تاوانەکانە.

## سورەتی یس

وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ اتَّقُوا مَا بَيْنَ أَيْدِيكُمْ وَمَا خَلْفَكُمْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٤٥﴾

کەواتە پارێزکاری چ لە پەروەردگار بێ یان لە سزاکەی بێ هۆکاری کەوتنە بەر بەزەیی پەروەردگارە.

## سورەتی الصافات

وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾

یەکەم وەسیەتی پێغەمبەر ئیلیاس سەلامی خوای لێ بێ بۆ گەلەکەی تەقوا بووە، وە تەقوا لەگەڵ بت پەرستی دژە و یەك ناگرێتەوە.

## سورەتی ص

أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾

بە پێی ئەم ئایەتە هیچ کات چاکەکار و پارێزکار لەگەڵ بەدکار و خراپەکار وەکو یەك نین. ئەمە تەرازووی تەواو ژیرییە کە نابێ چاکەکار و بەدکار وەکوو یەك بێ.

هَٰذَا ذِكۡرٞۚ وَإِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ لَحُسۡنَ مَـَٔابٖ ﴿٤٩﴾ جَنَّٰتِ عَدۡنٖ مُّفَتَّحَةٗ لَّهُمُ ٱلۡأَبۡوَٰبُ ﴿٥٠﴾ مُتَّكِـِٔينَ فِيهَا يَدۡعُونَ فِيهَا بِفَٰكِهَةٖ كَثِيرَةٖ وَشَرَابٖ ﴿٥١﴾ ۞وَعِندَهُمۡ قَٰصِرَٰتُ ٱلطَّرۡفِ أَتۡرَابٌ ﴿٥٢﴾ هَٰذَا مَا تُوعَدُونَ لِيَوۡمِ ٱلۡحِسَابِ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰذَا لَرِزۡقُنَا مَا لَهُۥ مِن نَّفَادٍ ﴿٥٤﴾

- تەقواکار باشترین سەرنجام و داهاتووی هەیە.
- بەهەشتانێك کە هەموو دەرگاکانی لەبەر دەمی والان.
- پاڵدانەوە.
- هەموو میوەیەك.
- هەموو خواردنەوەیەك.
- ئافرەتانێك کە تەنها چاویان بڕیوەتە هاوسەرەکانیان.

## سورەتی الزمر

١. قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾

بەپێی ئەم ئایەتە پیرۆزە تەقوا هاوتا و هاوکاری ڕێگای گەیشتن بە ئیحسانە، وە وەسیەتی پەروەردگارە بۆ بەندەکان، وە پارێزکار سابرە پاداشتی خۆڕاگران لە حساب نایا.

٢. قُلْ يَا عِبَادِ الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا رَبَّكُمْ لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الدُّنْيَا حَسَنَةٌ وَأَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةٌ إِنَّمَا يُوَفَّى الصَّابِرُونَ أَجْرَهُمْ بِغَيْرِ حِسَابٍ ﴿١٠﴾

هەر لە هەمان سورەت بە تەقوا دووبارە بووئەوە کە خوای گەورە لە باسی سزای ئاگردا ئەوەی فەرمووە، کەواتە تەقوا ڕێگای ڕزگار بوونە لە ئاگر، بەتایبەت ئەو ئاگرەی دەبێتە پێخەف و بەتانی بۆ دۆزەخیان.

٣. لَكِنِ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ لَهُمْ غُرَفٌ مِنْ فَوْقِهَا غُرَفٌ مَبْنِيَّةٌ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ وَعْدَ اللَّهِ لَا يُخْلِفُ اللَّهُ الْمِيعَادَ ﴿٢٠﴾

لەم ئایەتە پیرۆزە پەروەردگار بەڵێنی کۆشك و تەلاری چەند قاتی داوە بە پارێزکاران.

٤. أَفَمَنْ يَتَّقِي بِوَجْهِهِ سُوءَ الْعَذَابِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَقِيلَ لِلظَّالِمِينَ ذُوقُوا مَا كُنْتُمْ تَكْسِبُونَ ﴿٢٤﴾

لێرەدا تەقوا بە مانا زمانەوانیەکەی دێ، واتە کافرەکان ناچارن بە دەم و چاویان خۆیان لە ئاگر بپارێزن کە چاو سیما و جوانی مرۆڤە چونکە دەست و قاچ و گەردنیان کۆت و پێوەند کراوە.

٥. قُرْآنًا عَرَبِيًّا غَيْرَ ذِي عِوَجٍ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ ﴿٢٨﴾

کەواتە قورئان ڕێگای لە خوا ترسان و تەقوایە بەڵام بە کێ؟ بۆ پارێزکاران.

٦. وَالَّذِی جَاءَ بِالصِّدْقِ وَصَدَّقَ بِهِ أُولَٰئِكَ هُمُ الْمُتَّقُونَ ﴿٣٣﴾ لَهُمْ مَا يَشَاءُونَ عِنْدَ رَبِّهِمْ ذَٰلِكَ جَزَاءُ الْمُحْسِنِينَ ﴿٣٤﴾ لِيُكَفِّرَ اللَّهُ عَنْهُمْ أَسْوَأَ الَّذِی عَمِلُوا وَيَجْزِيَهُمْ أَجْرَهُمْ بِأَحْسَنِ الَّذِی كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿٣٥﴾

ئەم چەند ئایەتە پیرۆزە باسی ڕێگا و پاداشتی پارێزگارانە:

- ڕێگای گەیشتن بە تەقوا ئەوەیە کە حەق و ڕاستیت پێ بێ.
- وە پشتیوانی لێ بکەیی و بەرگری لێ بکەی.
- پاداشتەکەشی ئەوەیە لای پەروەردگار چیت بویٚ دەستی دەخەی.
- دەچیە ڕیزی (محسن) چاکەکاران.
- ڕەشبوونەوەی تاوانەکان، بەڵکوو هەتا ئەگەر تاوانەکان خراپترین بن.
- پاداشتەکەشی بە پێی چاکترینی کردەوەکان، بەڕاستی ئەمە بەخششێکی زۆر گەورەیە.

٧. أَوْ تَقُولَ لَوْ أَنَّ اللَّهَ هَدَانِی لَكُنْتُ مِنَ الْمُتَّقِينَ ﴿٥٧﴾

تەقوا ئەم سیفەتە بەرزەیە کە تاوانباران و دۆڕاوان هەمیشە خۆزگەی بۆ دەخوازن.

٨. وَيُنَجِّی اللَّهُ الَّذِينَ اتَّقَوْا بِمَفَازَتِهِمْ لَا يَمَسُّهُمُ السُّوءُ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ﴿٦١﴾

پەروەردگار بەڵێنی ڕزگاری داوە بە پارێزکاران لە دوواڕۆژدا، کە دەفەرمووێ نارەحەتیان توش نابێ و خەمباریش نابن.

٩. وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَرًا حَتَّى إِذَا جَاءُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ ﴿٧٣﴾

- ✓ پارێزکاران لە دوواڕۆژدا دەستە دەستە بە شێوەی وەفد بۆ لای پەروەردگار یان دەگەڕێنەوە.
- ✓ دەرگاکانی بەهەشتیان لەبەر دەم کراوە دەبێ.
- ✓ دەرگەوانەکانی بەهەشت بە سەلام و دڵنیا کردنەوە پێشوازیان لێدەکەن وە مزگێنی پاك بوونەوەیان پێ دەدەن.
- ✓ وە پێیان دەڵێن بۆ هەتا هەتایە لەم نازو نیعمەتەدا دەمێننەوە.

## سورەتی غافر

١. وَقِهِمُ السَّيِّئَاتِ ۚ وَمَنْ تَقِ السَّيِّئَاتِ يَوْمَئِذٍ فَقَدْ رَحِمْتَهُ ۚ وَذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿٩﴾

لێرەدا تەقوا نزا و پاڕانەوەیە بۆ پارێزکارانی بڕواداران لە ئاگر و ناخۆشیەکانی دوواڕۆژ.

٢. فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ ﴿٤٥﴾

لێرەشدا خوای گەورە باسی ئەو بڕووادارە دەکا کە لە سەخترین کاتدا ئیمانی خۆی ئاشکرا کرد بەرامبەر بە ستەم کارترینی خەڵك

کە بانگەشەی پەروەردگاریەتی و پەرستراویەتی بۆ خۆی دەکرد (فوقه الله) خوای گەورە ڕزگاری کرد کە تەقوا لە (وقایه) وە هاتووە.

## سورەتی فصلت

وَنَجَّيْنَا الَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ ﴿١٨﴾

کاتێك سزای پەروەردگار هات بۆ گەلی (سەمود) تەنیا تەقواکاران ڕزگاریان بوو، مادام لەگەڵ ئیماندا باسی کرا تەقوا جیاوازە و بریتییە لە زیادە خۆپارێزی جگە لە ئیمان بگرە لە تاوانیش.

## سورەتی الزخروف

١. وَزُخْرُفًا وَإِنْ كُلُّ ذَلِكَ لَمَّا مَتَاعُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَالْآخِرَةُ عِنْدَ رَبِّكَ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٣٥﴾

لەدوای ئەوەی کە خوای گەورە باسی ئەوەی کرد کە بوونی ماڵ و سامان پێوەری چاکی و خراپی نیە، ئەگەر لەبەر گومڕا بوونی خەڵك نەبووایە خوای گورە کافرانی دەکردە دەوڵەمەندترینی

خەڵك، بەڵام بوونی دوواڕۆژ و سەركەوتنی ئەوێ بە پێوەری تەقوایە، كە ئەوە بۆ پارێزكارانە.

٢. ٱلْأَخِلَّآءُ يَوْمَئِذٍۭ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ إِلَّا ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٦٧﴾ يَٰعِبَادِ لَا خَوْفٌ عَلَيْكُمُ ٱلْيَوْمَ وَلَآ أَنتُمْ تَحْزَنُونَ ﴿٦٨﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ مُسْلِمِينَ ﴿٦٩﴾ ٱدْخُلُواْ ٱلْجَنَّةَ أَنتُمْ وَأَزْوَٰجُكُمْ تُحْبَرُونَ ﴿٧٠﴾ يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ وَأَكْوَابٍ ۖ وَفِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ ٱلْأَنفُسُ وَتَلَذُّ ٱلْأَعْيُنُ ۖ وَأَنتُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ ﴿٧١﴾ وَتِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِيٓ أُورِثْتُمُوهَا بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٧٢﴾ لَكُمْ فِيهَا فَٰكِهَةٌ كَثِيرَةٌ مِّنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٧٣﴾

خوای گەورە دەفەرمووێ دۆستان و خۆشەویستان لە دوواڕۆژدا حاشا لە یەكتر دەكەن و یەخە لە یەكتر دادەڕنن تەنها پارێزكاران نەبن، كە دواتر بە ئیمان و ئیسلام تەعبیری لە مانای تەقوا كرد، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە تەقواكار هەم مسوڵمان و هەم بڕوادار، جگە لەم هەموو نازوو نیعمەتەی كە بۆ پارێزكاران بڕیار دراوە.

## سورەتی الدخان

- إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِي مَقَامٍ أَمِينٍ ﴿٥١﴾ فِي جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٢﴾ يَلْبَسُونَ مِن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٥٣﴾ كَذَٰلِكَ وَزَوَّجْنَٰهُم بِحُورٍ عِينٍ ﴿٥٤﴾ يَدْعُونَ فِيهَا بِكُلِّ فَٰكِهَةٍ ءَامِنِينَ ﴿٥٥﴾ لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ ۖ وَوَقَىٰهُمْ عَذَابَ ٱلْجَحِيمِ ﴿٥٦﴾ فَضْلًا مِّن رَّبِّكَ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَوْزُ ٱلْعَظِيمُ ﴿٥٧﴾

خوای گەورە باسی پاداشتی تەقواكاران دەكا لەو پاداشتانە:

- ژیان لە ئەمان و دڵنیاییدا.
- چەندین باخ و بێستان.
- سەرچاوەی ئاوی جۆراو جۆر.
- ڕازانەوە بە ئاوریشمی تەنك و ئەستوور.
- دانیشتن بەرامەر یەك و قسەو باس كردن.
- بوونە هاوسەر لەگەڵ جوانترینی ئافرەتان، دیارە بۆ ئافرەتانیش باشترین و جوانترینی پیاوان هەیە.
- هەرچی میوەیەك بیخوازی و داوای بكەی هەیە .

## سورەتی الجاثية

ثُمَّ جَعَلۡنَـٰكَ عَلَىٰ شَرِيعَةٍ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ فَٱتَّبِعۡهَا وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَ ٱلَّذِينَ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُمۡ لَن يُغۡنُواْ عَنكَ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ وَإِنَّ ٱلظَّـٰلِمِينَ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٍۖ وَٱللَّهُ وَلِيُّ ٱلۡمُتَّقِينَ ﴿١٩﴾

گەیشتن بە پلەی تەقوا و وەلی بوون بەوە دەبێ مرۆڤ شوێنی شەریعەت بكەوێ نەوەك ئارەزووەكانی، وە ئارەزووی نەزانان وە ئەو ئارەزوو بازانە سودیان پێوە نیە بۆ كەس وە ستەم كاران هەمیشە لە پشتی دەوەستن دژی بڕواداران، وە دڵنیا بوون لەوەی كە خوای گەورە دۆست و یاوەری و پشتیوانی پارێزكارانە.

## سورەتی محمد

**١.** مَّثَلُ ٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي وُعِدَ ٱلۡمُتَّقُونَۖ فِيهَآ أَنۡهَٰرٞ مِّن مَّآءٍ غَيۡرِ ءَاسِنٖ وَأَنۡهَٰرٞ مِّن لَّبَنٖ لَّمۡ يَتَغَيَّرۡ طَعۡمُهُۥ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ خَمۡرٖ لَّذَّةٖ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنۡهَٰرٞ مِّنۡ عَسَلٖ مُّصَفّٗىۖ وَلَهُمۡ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡۖ كَمَنۡ هُوَ خَٰلِدٞ فِي ٱلنَّارِ وَسُقُواْ مَآءً حَمِيمٗا فَقَطَّعَ أَمۡعَآءَهُمۡ ﴿١٥﴾

ئەو بەهەشتە چۆنە کە بە تەقواکاران بەڵێن دراوە؟ :

- ڕووبار گەلێك لە ئاوی سازگار کە قەت ناگۆڕێ و تێك ناچێ.
- ڕووبار گەلێك لە شیری هەڵچنەبزڕکاو.
- رشوبار گەلێك لە شەرابی باتام بۆ ئەوانەی نۆشی دەکەن.
- رشوبار گەلێك لە هەنگوینی ساف.
- وە لە هەموو میوە و سەوزەواتێك.
- وە لێخۆشبوونی پەروەردگار.
- وە دووری لە سزای سەختی دۆزەخ و خواردنەوەی ئاوی گەرم کە هەناو داخ دەکا و ریخۆڵەکان پارچە پارچە دەکا.

**٢.** إِنَّمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا لَعِبٞ وَلَهۡوٞۚ وَإِن تُؤۡمِنُواْ وَتَتَّقُواْ يُؤۡتِكُمۡ أُجُورَكُمۡ وَلَا يَسۡـَٔلۡكُمۡ أَمۡوَٰلَكُمۡ ﴿٣٦﴾ إِن يَسۡـَٔلۡكُمُوهَا فَيُحۡفِكُمۡ تَبۡخَلُواْ وَيُخۡرِجۡ أَضۡغَٰنَكُمۡ ﴿٣٧﴾

ژیانی دوونیا هەم دڵ سەرقاڵ دەکا هەم لاشە، تەنیا بڕووا و تەقوا مرۆڤ دەپارێزێ و دەیکاتە خاوەن پاداشتی لە بن نەهاتوو لە دوونیا و دواڕۆژ.

## سورەتی الفتح

إِذْ جَعَلَ الَّذِينَ كَفَرُوا فِي قُلُوبِهِمُ الْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ الْجَاهِلِيَّةِ فَأَنْزَلَ اللَّهُ سَكِينَتَهُ عَلَى رَسُولِهِ وَعَلَى الْمُؤْمِنِينَ وَأَلْزَمَهُمْ كَلِمَةَ التَّقْوَى وَكَانُوا أَحَقَّ بِهَا وَأَهْلَهَا وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا ﴿٢٦﴾

لەبەرامبەر ئەو لە خۆبایی بوون و خۆ بە زلگریەی هاوبەش پەرستەکان هەیانە بەرامبەر وەرگرتنی ڕاستی و پابەند بوونی، خوای گەورە ئارامی و ئۆخژنی دابەزاندە سەر پێغەمبەر و بڕوواداران، وە پابەندی کردن بە وشەی تەقوا، وە ئەوان شایەنترین کەسن بەو وشەیە، وە ئەوان ئەهلی ئەو وشەیەن، لێرەدا وشەی تەقوا یان لا اله الا الله یە، یان ئیخلاس و ساغ بوونەوەیە بۆ خوا، هەرکامێکیان بێ یان هەردووکیان بێ ئەمە تایبەت مەندیەکی زۆر گەورەیە بۆ وشەی تەقوا.

## سورەتی الحجرات

١. إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَى لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾

بە پێی ئەم ئایەتە کەسی موتەقی نابێ پێش دەستی بکا لە سەر بڕیاری خوا و پێغەمبەرەکەی، ئەمە ئەو پەڕی تەقوا کارییە کە مسوڵمان پابەندە بە شەریعەتەوە.

٢. إِنَّ الَّذِينَ يَغُضُّونَ أَصْوَاتَهُمْ عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ امْتَحَنَ اللَّهُ قُلُوبَهُمْ لِلتَّقْوَىٰ لَهُمْ مَغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿٣﴾

ئەم ئایەتە پیرۆزە پێمان دەفەرمووێ ڕێگای گەیشتن بە تەقوا و دڵ پاکبوونەوە ئەدەب لە خزمەت پێغەمبەرە علیه الصلاه والسلام.

٣. إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾

تەقوا ڕێگایەکی باشە بۆ برایەتی و میهرەبانی پەروەردگار کە هۆکاری بەختەوەرین بۆ دوونیا و دوواڕۆژ.

٤. يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَىٰ وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ ﴿١٣﴾

ئەم ئایەتە پیرۆزە بناغەی جاڕنامەی مافی مرۆڤە چوونکە پێمان دەڵێ:

- ✓ هەموومان یەکین لە مەخلووقیەتدا.
- ✓ هەموومان یەك خالقمان هەیە.
- ✓ هەموومان یەك کان و مەعدەنین.
- ✓ هەموومان یەك بەرپرسیاریەتیمان هەیە.

- ✓ هۆز و گەل بوون کاری خوایە و پێوەر نیە بۆ چاکی و خەراپی.
- ✓ تاکە پێوەر بۆ چاکی و خراپی لە خوا ترسان و خزمەتی خەڵک کردنە.
- ✓ ئامانج لە جیاوازیمان یەکتر ناسینمانە.
- ✓ یەکتر ناسی نابێ بەبێ گفتووگۆ و حیوار.
- ✓ بەرهەمی حیوار لەیەك تێگەیشتنە.
- ✓ دواتر (تعايش) و پێکەوە ژیان.
- ✓ کەسیش بۆی نیە پۆز بەسەر ئەوی تردا لێ بدا.
- ✓ کەسیش بۆی نیە پاکانە بۆ خۆی بکات چوونکە پەروەردگار پێمان ئاگادارە.
- ✓ کەواتە یەکتر کووژی و مافی یەکتر زەوتکردن پێچەوانەی ئەوەیە کە مرۆڤی لە پێناودا درووست بووە.

## سورەتی ق

وَأُزْلِفَتِ الْجَنَّةُ لِلْمُتَّقِينَ غَيْرَ بَعِيدٍ ﴿٣١﴾

لێرەدا باسی پاداشتی تەقواکاران دەکرێ لە بەرامبەر هەرەشە لە بەدکاران، پارێزکاران بەهەشتیان بۆ دەڕازێندرێتەوە و نزیک دەکرێتەوە، ئەوە گەورەترین ڕێزە بۆ پارێزکاران نیشان دەدرێ، چونکە هەموو نیعمەت و خۆشیەکانی تر بە بەهەشت دەست پێ دەکات.

## سورەتی الذاريات

إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٥﴾ ءَاخِذِينَ مَآ ءَاتَىٰهُمْ رَبُّهُمْ ۚ إِنَّهُمْ كَانُواْ قَبْلَ ذَٰلِكَ مُحْسِنِينَ ﴿١٦﴾ كَانُواْ قَلِيلًا مِّنَ ٱلَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ ﴿١٧﴾ وَبِٱلْأَسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴿١٨﴾ وَفِىٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ لِّلسَّآئِلِ وَٱلْمَحْرُومِ ﴿١٩﴾

خوایە گەورە لەم ئایەتانە باسی پاداشت و خەسڵەتی پارێزکاران دەکات، پاداشتیان ئەوەیە کە لە ناو چەندین باخ و باخات دایە، وە لە ناو چەندین کانی و سەرچاوەدان، لەدوونیادا جوانی و خۆشی ئاو و دارستانە.

بۆچی بوونە خاوەنی ئەو پاداشتە گەورە؟ چوونکە:

- فەرمانی خوایان بە دڵ وەرگرتووە و بە کردەوە جێ بە بێیان کردووە.

- لە شەواندا کەم دەخەوتن. خوای گەورە لەسەر نووستنەکەیان مەدحیان دەکات، واتە لەسەر خەوەکەشیان جێگای پیا هەڵدانن چ جای بە خەبەرییان.
- لەبەرە بەیان و پێش نوێژی بەیانی سەرگەرمی داوای لێبووردن کرددنن وەك ئەوەی کە بە دێژای شەو تاوانیان کردبێ.
- خەڵکان بەشدار دەکەن لە ماڵی خۆیان چ بۆ ئەوانەی داوا دەکەن و لەدەرگا دەدەن، وە چ بۆ ئەوانەی داوا ناکەن و دەگا بە خەڵك ناگرن.

## سورەتی الطور

إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي جَنَّـٰتٖ وَنَعِيمٖ ﴿١٧﴾ فَـٰكِهِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ وَوَقَىٰهُمۡ رَبُّهُمۡ عَذَابَ ٱلۡجَحِيمِ ﴿١٨﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿١٩﴾ مُتَّكِـِٔينَ عَلَىٰ سُرُرٖ مَّصۡفُوفَةٖۖ وَزَوَّجۡنَـٰهُم بِحُورٍ عِينٖ ﴿٢٠﴾

لێرە خوای گورە باسی پاداشتی تەقواکاران دەکات کە لە ناو:

- ✓ باخ و بێستاندان.
- ✓ لەناو جۆرەها ناز و نیعمەتدان.
- ✓ دڵخۆشن بەوەی خوای گورە پێی داون.
- ✓ خوای گەورە پاراستونی لە سزای دۆزەخ.

- ✓ پێیان دەگوترێ بخۆن و بخۆنەوە نەوشی گیانتان بێ ئەوە بەر و بەرهەمی کارە باشەکانتانە.
- ✓ لەسەر قەنەفە و قەرەوێڵەی بەرز و ڕیزکراو پاڵ دەدەنەوە.
- ✓ لەگەڵ جوانتریی ئافرەتان دەبن بە هاوسەر، بۆ ئافرەتانیش جوانترین و باشترینی پیاوەکانیان دەبن بە هاوسەر.

## سورەتی النجم

الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ هُوَ أَعْلَمُ بِكُمْ إِذْ أَنْشَأَكُمْ مِنَ الْأَرْضِ وَإِذْ أَنْتُمْ أَجِنَّةٌ فِي بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ فَلَا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقَى ﴿٣٢﴾

ئەم ئایەتە پیرۆزانە پێمان دەڵێن پاداشتی چاکەکار لای پەروەردگار ون نابێ، وە چاکەش ئەوەیە بە پێی توانا خۆت لە تاوانی گەورە بپارێزێ، ئەمەیە ڕێگای تەقوا نەوەك پاساو هێنانەوە و پاکانەی خۆکردن.

## سورەتی الحديد

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيَجْعَلْ لَكُمْ نُورًا تَمْشُونَ بِهِ وَيَغْفِرْ لَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ ﴿٢٨﴾

تەقوا وەسیەتی چەند بارەی پەروەردگارە بۆ بەندەکان. ئیمان و تەقوا پاداشت دووقات دەکاتەوە.

دەبێتە نوور و ڕۆشنای بۆ دوونیا و دوواڕۆژ، وە دەبێتە هۆی لێ خۆشبووی پەروەردگار.

## سورەتی المجادلة

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا تَنَاجَيْتُمْ فَلَا تَتَنَاجَوْا بِالْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَمَعْصِيَتِ الرَّسُولِ وَتَنَاجَوْا بِالْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي إِلَيْهِ تُحْشَرُونَ ﴿٩﴾

بە چپە چپ و فسکە فسك قسەکردن بە گشتی ڕەوشتێکی پەسەند نیە بۆ مرۆڤی خاوەن کەسایەتی مەگەر بەناچاری نەبێ، جولەکە و دووڕوەکان بەردەوام ئەوەیان کردبوو پیشە ئامانجیشیان ئەوەبوو مسوڵمانان خەمبار بکەن و بیان ترسێنن، خوای گەورە بڕواداران وریا دەکاتەوە لە ئەگەر چپە چپەکەیان بە تەقوا نەبێ نابێ بیکەن، لێرەدا تەقوا پێچەوانەی ئەوەیە کە چپە چپەکە بەتاوان و سەرپێچی پێغەمبەر بێ علیه الصلاه والسلام. کەواتە تەقواکار چپە چپی خێر نەبێ نایکات.

## سورەتی الحشر

**١.** مَا أَفَاءَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ مِنْ أَهْلِ الْقُرَى فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنْكُمْ وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ ﴿٧﴾

لێرەدا تەقوا بریتییە لەوەی هەرچی پێغەمبەر پێیدای وەری بگری لە واجبات و سونەت و موباح، هەرچی لێی قەدەغەکردن بە فەرمانی خوا لێی بەدوورکەوی، وە بە حوکم و حاکمایەتیەکەی ڕازی بی، وە لە کۆمەڵگادا دادوەی بەرپا بکرێ.

**٢.** وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِنْ قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنْفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿٩﴾

خۆپاراستن لە پڕوکی و ڕژدی ڕێگای گەیشتن بە تەقوایە، چوونکە(یوق) واتە پاراستن تەقواش خۆپارێزییە.

**٣.** يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَلْتَنْظُرْ نَفْسٌ مَا قَدَّمَتْ لِغَدٍ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ ﴿١٨﴾

لێرەدا تەقوا بریتییە لە خۆ ئامادەکردن بۆ دوواڕۆژێکی نزیك کە قیامەتە کەسێك حساب بۆ دوواڕۆژ نەکا و خۆ ئامادە نەکا هەرگیز لە ڕیزی پارێزکاران نیە، لەم ئایەتەدا دووجار فەرمان بە تەقوا هاتووە:

- بۆ خۆئامادەکردن و چاوەڕوان بونی دوواڕۆژ.
- بۆ هەست کردنە بۆ چاودێری پەروەردگارە کە بە هەموو شتێك ئاگادارە.

## سورەتی الممتحنة

وَإِنْ فَاتَكُمْ شَيْءٌ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ إِلَى الْكُفَّارِ فَعَاقَبْتُمْ فَآتُوا الَّذِينَ ذَهَبَتْ أَزْوَاجُهُمْ مِثْلَ مَا أَنْفَقُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي أَنْتُمْ بِهِ مُؤْمِنُونَ ﴿١١﴾

تەقوا پابەندییە بە یاساکانەوە، بەتایبەت ئەو یاسایانەی کە پەیوەندی بە مافی ئافرەتان و ئەحکامی ئافرەتانەوە هەیە، وە تەقوا ئەوەیە کە مسوڵمانان زیانێکیان پێگەیشت دەبێ هاوکاری یەکتر بن وەک ئەوانەی خێزانەکانیان کافر بوون و بێژن مانەوە پێویستیان بە ژن هێنانەوەیە، وە ئەوانەش کە ژنێکی کافری هاڵاتووی مارە کردووە لە دوای ئەوەی کە مسوڵمان بووە دەبێ پارەبدات بە مێردە کافرەکەی، بە کورتی تەقوا واتە هاوکاری و بە خەم یەکەوەبوون.

## سورەتی التغبن

فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ وَاسْمَعُوا وَأَطِيعُوا وَأَنْفِقُوا خَيْرًا لِأَنْفُسِكُمْ وَمَنْ يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٦﴾

(فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ)ئەم ڕستەیە وەڵامی سەدان پرسیاری پێ دەدرێتەوە، کە مرۆڤ بە پێی توانای خۆی دەتوانێ کار بکا و هەوڵ

بدات، هەرچەند بابەتەکە پەیوەستە بە هەڵس و کەوت لەگەڵ ماڵ و منداڵ بەڵام هەموو بوارەکانی ژیان دەگرێتەوە.

وە رێگای گەیستن بە سەر بەرزی و سەرکەوتن ئەوەیە کە مرۆڤ دوور بێ لە خۆپەرستی (کە بەخیلییە)، چونکە بەخیل و چروك تەنیا خۆی دەبینێ و هەوڵ بەس بۆ خۆی دەدات.

## سورەتی الطلاق

يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ إِذَا طَلَّقۡتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَطَلِّقُوهُنَّ لِعِدَّتِهِنَّ وَأَحۡصُواْ ٱلۡعِدَّةَۖ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ رَبَّكُمۡۖ لَا تُخۡرِجُوهُنَّ مِنۢ بُيُوتِهِنَّ وَلَا يَخۡرُجۡنَ إِلَّآ أَن يَأۡتِينَ بِفَٰحِشَةٖ مُّبَيِّنَةٖۚ وَتِلۡكَ حُدُودُ ٱللَّهِۚ وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ ٱللَّهِ فَقَدۡ ظَلَمَ نَفۡسَهُۥۚ لَا تَدۡرِي لَعَلَّ ٱللَّهَ يُحۡدِثُ بَعۡدَ ذَٰلِكَ أَمۡرٗا ﴿١﴾ فَإِذَا بَلَغۡنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمۡسِكُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٍ أَوۡ فَارِقُوهُنَّ بِمَعۡرُوفٖ وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِۚ ذَٰلِكُمۡ يُوعَظُ بِهِۦ مَن كَانَ يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ﴿٢﴾ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ﴿٣﴾ وَٱلَّٰٓـِٔي يَئِسۡنَ مِنَ ٱلۡمَحِيضِ مِن نِّسَآئِكُمۡ إِنِ ٱرۡتَبۡتُمۡ فَعِدَّتُهُنَّ ثَلَٰثَةُ أَشۡهُرٖ وَٱلَّٰٓـِٔي لَمۡ يَحِضۡنَۚ وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مِنۡ أَمۡرِهِۦ يُسۡرٗا ﴿٤﴾

١. لە ئایەتی یەکەم کە باسی تەڵاقدانی ژن دەکات سەرەتا پێمان دەفەرمووێ لەکاتی عیددەی خۆی تەڵاقی بدەن، واتا تەقوا ئەوەیە

کە لەکاتی خۆی تەڵاق بدرێ. ئەمە دەرفەتی تەڵاقدان کەم دەکاتەوە چوونکە بۆت نیە هەرکات بتهەوێ ژن تەڵاق بدەی لە تەڵاقدان دا پێویستە ئەم خاڵانە ڕەچاو بکەی:

- دەبێ بزانی تەڵاقدان بێ هۆ کارێکی ڕەوا قەدەغەیە.
- دەبێ ئەگەر ژنەکە ناشیزەبوو، بێ هۆ لەگەڵ هاوسەرەکەی نەدەگوونجا و گوێڕایەڵی نەدەکرد دەبێ ئامۆژگاری بکات.
- ئەگەر ئامۆژگاری سودی نەبوو دەبێ جێگای لێ جیا بکەتەوە لە شوێنی تایبەت بە خۆیان نەوەك لەبەر چاوی منداڵ و کەس و کار.
- ئەگەر هەر سوودی نەبوو دەتوانی پەنا بۆ تەمبێکردن بەری، بەڵام نەوەك بۆ تۆڵە سەندنەوە و سوکایەتی کردن .
- ئەگەر سوودی نەبێ دەتوانن حەکەم بگرن لە بەینی خۆیان لە کەسوو کاری هەردووکیان بن و دڵسۆز بن.
- ئەگەر هەر سوودی نەبوو دەتوانێ پەنا بۆ تەڵاقی یەکەم بەرێ ئەمەش هەنگاوێکە بۆ چارەسەر کردن.
- وەنابێ تەڵاقی سێ بە سێ بەکار بهێنێ درووست نیە.
- ئەگەر تەڵاقی یەکەمی دا نابێ لەکاتی سووڕی مانگانە بێ.
- نابێ لەکاتی پاکیەکدابێ لە گەڵیا جوون بووبێ.
- ئەگەر هەر چاك نەبوو تەڵاقی دووەمیش بە هەمان ڕێکار.
- ئەگەر هەر چاک نەبێ ئەو جار تەڵاقی سێیەمی بدات.

- ئەگەر تەڵاقی یەکەم و دووەمی دا نابێ لەماڵەکەی خۆی دەری بکات.
- دەبێ نەفەقەی بکێشێ.
- دەشتوانێ تەحەمولی خەراپیەکانی بکات و تەڵاقی نەدا بەڵکوو چاک ببێ بەوە دەگوترێ تەقوا.

٢. لە تەڵاقی (رەجعیدا) پیاوەکە دوو ڕێگەی لەبەر دەم دایە یان بەچاکە بیگرێتە خۆی یان بەچاکە ئازادی بکات، وە دوو شایەتی دادگەریش بگرێ لەم کاتەدا.

٣. ئەگەر پیاوکە لە تەڵاقی (رەجعیدا) نەیگێڕایەوە تا عیددەی بەسەر چوو ئەوە مافی بەسەر ژنەکەیەوە نامێنی، هەتا ژنەکە ڕازی نەبێ ناتوانێ بیگێڕێتەوە، وە دەبێ سەرلەنوێ مارەی کاتەوە و مارەیی نوێی بۆ دابنێتەوە بەوە دەڵێن تەقوا.

٤. خوای گورە بەڵێنی داوە هەرکەس تەقوای خوا بکات دەرووی خێری لێ بکاتەوە، وە ڕۆزی بدا بە ئەندازە و بە شێوازێك کە خۆشی بیری بۆ ناچێ.

٥. وە دەبێ بەتەواوی ڕەچاوی عیددەی ئافرەت بکرێ چ سووری مانگانە ببینێ یان نەیبینێ جا لەبەر پیری نەیبینی یان لەبەر بچوکی یان لەبەر نەخۆشی، یان بە تەبیعەت وابوو نەیدەبینی یان دووگیان بێ، تەقوا ئەوەیە ڕەچاوی ئەوانە بکەین:

- ڕەچاو کردنی هەموو حوکمە شەرعیەکان نیشانەی تەقوایە.

- خوای گەورە بەڵێنی کار ئاسانی بە تەقواکاران داوە.
- خوای گەورە بەڵێنی داوە لە گوناهیان خۆشبێ و بەڵێنی پێداون پاداشتیان بۆ زیادوو گەورە بکات.

أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُمۡ عَذَابًا شَدِيدًاۖ فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ قَدۡ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكُمۡ ذِكۡرًا ﴿١٠﴾ رَّسُولًا يَتۡلُواْ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ مُبَيِّنَٰتٖ لِّيُخۡرِجَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِۚ وَمَن يُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ وَيَعۡمَلۡ صَٰلِحٗا يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ قَدۡ أَحۡسَنَ ٱللَّهُ لَهُۥ رِزۡقًا ﴿١١﴾

ئەم ئایەتە پیرۆزە پێمان دەڵێ تەقوا خۆپاراستنە لەو سزایانەی کە توشی گەلانی پێشتر بووە. وە تەقوا ڕێگایەکە بۆ بڕواکردن بە پێغەمبەری ئازیز کە ڕزگاریکارە ئیمان لە کوفرەوە بەرەو ئیمان و لە تاریکیەوە بەرەو ڕوناکی.

## سورەتی التحریم

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَأَهْلِيكُمْ نَارًا وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ عَلَيْهَا مَلَائِكَةٌ غِلَاظٌ شِدَادٌ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ﴿٦﴾

وشەی(قوا) واتا بپارێزن کەواتە گەرەترین تەقوا ئەوەیە کە مسوڵمان ماڵ و منالی بپارێزێ لە سزای ئاگر.

## سورەتی القلم

إِنَّ لِلْمُتَّقِينَ عِنْدَ رَبِّهِمْ جَنَّاتِ النَّعِيمِ ﴿٣٤﴾

ئەو گەنجانەی کە لە ڕێو شوێنی باوکیان لایاندا و بڕیاریان دا کە هاوکاری هەژاران نەکەن و لە ڕێی تەقوا لایان دا توشی سزا بوون خوای گەورە بڕیاری نازوو نیعمەتی دین و دوونیای بۆ پارێزکاران داوە.

## سورەتی الحاقة

وَإِنَّهُ لَتَذْكِرَةٌ لِلْمُتَّقِينَ ﴿٤٨﴾

قورئان بۆ پارێزکاران مایەی سەربەرزی و ئامۆژگاری و یادخستنەوەیە کەواتە بەهرەمەندی گەورە لە قورئان پارێزکارانن.

## سورەتی نوح

أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱتَّقُوهُ وَأَطِيعُونِ ﴿٣﴾ يَغْفِرْ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمْ وَيُؤَخِّرْكُمْ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّىۚ إِنَّ أَجَلَ ٱللَّهِ إِذَا جَآءَ لَا يُؤَخَّرُۚ لَوْ كُنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴿٤﴾

تەقوا لەنێوان گوێڕایەڵی و بەندایەتی باسی کراوە، کەواتە تەقوا بەشی لە هەردووکیان دا هەیە و هاوکارە بۆ هەردووکیان وە بەرهەمی ئەم سێ بەندایەتیە لێخۆشبوونی پەروەردگار و لاچوونی سزایە و درێژبوونی تەمەن و بەرەکەتداریە لە ژیاندا.

## سورەتی المزمل

فَكَيْفَ تَتَّقُونَ إِن كَفَرْتُمْ يَوْمًا يَجْعَلُ ٱلْوِلْدَٰنَ شِيبًا ﴿١٧﴾ ٱلسَّمَآءُ مُنفَطِرٌۢ بِهِۦ ۚ كَانَ وَعْدُهُۥ مَفْعُولًا ﴿١٨﴾

کەواتە تەنیا تەقوایە ڕزگارمان دەکات لەو ڕۆژەی کە سەری منداڵ سپی دەکا و ئاسمانەکان وردوو خاش دەکات.

## سورەتی المدثر

وَمَا يَذْكُرُونَ إِلَّا أَنْ يَشَاءَ اللَّهُ هُوَ أَهْلُ التَّقْوَى وَأَهْلُ الْمَغْفِرَةِ (56)

خوای گەورە شایەنی ئەوەیە کە تەقوای لێبکرێ و شەرمی لێ بکرێ وە خوای گەورە شایەنی لێ خۆش بوونە.

## سورەتی الدهر

فَوَقَاهُمُ اللَّهُ شَرَّ ذَلِكَ الْيَوْمِ وَلَقَّاهُمْ نَضْرَةً وَسُرُورًا ﴿١١﴾

چاکەکاران هەرچی کردیان لەبەر خوا بوو خوای گەورەش ئەوانی پاراست لە سزاو چەندین چاکەو بەهرەی پێ خەڵات کردن.

## سورەتی المرسلات

إِنَّ ٱلۡمُتَّقِينَ فِي ظِلَٰلٖ وَعُيُونٖ ﴿٤١﴾ وَفَوَٰكِهَ مِمَّا يَشۡتَهُونَ ﴿٤٢﴾ كُلُواْ وَٱشۡرَبُواْ هَنِيٓـَٔۢا بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ﴿٤٣﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٤٤﴾

ئەمانە پاداشتی پارێزکارانە:

لەناو سایە و سێبەری دوور و درێژ.

سەرچاوە و کانی.

ئەو میوانەی کە حەزی لێدەکەن.

پێیان دەگوترێ بخۆن و بخۆنەوە نۆشی گیانتان بێ ئەمە، خۆشیەکی دەروونیە.

ئەوانە شایەنی ئەوەن کە ناویان محسنین بێ.

## سورەتی النبأ

إِنَّ لِلۡمُتَّقِينَ مَفَازًا ﴿٣١﴾ حَدَآئِقَ وَأَعۡنَٰبٗا ﴿٣٢﴾ وَكَوَاعِبَ أَتۡرَابٗا ﴿٣٣﴾ وَكَأۡسٗا دِهَاقٗا ﴿٣٤﴾ لَّا يَسۡمَعُونَ فِيهَا لَغۡوٗا وَلَا كِذَّٰبٗا ﴿٣٥﴾ جَزَآءٗ مِّن رَّبِّكَ عَطَآءً حِسَابٗا ﴿٣٦﴾

بۆ پارێزکاران ئەم پاداشتانە هەن:

- ✓ سەرکەوتنی گەورە و ئاشرا کە خۆی دەبینێتەوە لە چەندین باخچە و حەدیقەی گەورە و جۆراوجۆر.
- ✓ چەندین جۆری ترێ.
- ✓ ئافرەتانی تازە پێگەیشت و هاوتەمەن.
- ✓ پیاڵەی جوان و ساف و بەردەوام پڕ.
- ✓ نە وتەی بێ کەڵک دەبیستن نە درۆ.
- ✓ ئەوانە هەمووی پاداشتی پەروەردگارن و بێ ژمارەیە هێندە زۆرە، یان کافیە بۆ ئەوان.
- ✓

## سوڕەتی الشمس

فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا ﴿٨﴾

خوای گەورە لە دووای یازدە سوێند ئەم ڕاستیە بەگوێماندا دەدا ئەویش ئەوەیە کەلەناخی مرۆڤدا چاکە و خراپە دانراوە و نێژراوە جا مرۆڤ کامیان پەروەردە کات ئەوەیان بەهێز دەبێ و زاڵ دەبێ.

## سورەتی اللیل

فَأَمَّا مَنْ أَعْطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ﴿٥﴾ وَصَدَّقَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٦﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْيُسْرَىٰ ﴿٧﴾

خوای گەورە سوێند دەخوا لەسەر ئەوەی کە هەوڵ و کۆششی مرۆڤ جیاوازە بە ئاڕاستەی جیاواز. جا ئەوەی بەخشەروو

پارێزەرە، بڕووای بە جاکە و بەهەشت هەبێ، خوای گەورە ڕێگای چاکە و بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات.

وَسَيُجَنَّبُهَا ٱلۡأَتۡقَى ۝١٧ ٱلَّذِي يُؤۡتِي مَالَهُۥ يَتَزَكَّىٰ ۝١٨ وَمَا لِأَحَدٍ عِندَهُۥ مِن نِّعۡمَةٖ تُجۡزَىٰٓ ۝١٩ إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٢٠ وَلَسَوۡفَ يَرۡضَىٰ ۝٢١

بە دەقی ئەم ئایەتە پارێزکار پارێزاراوە لە ئاگری دۆزەخ، تەقواکار ئەو کەسەیە دەبەخشێ و خۆی پاک دەکاتەوە لە تاوان.

خوای گەورە بەڵێنی پێداوە ڕازی بکات، بەڕاستی ئەم ڕێز گرتنێکی یەکجار گەورەیە، ئەم پارێزکارە هەرچی دەیکات بێ بەرامبەر و بێ منەتە، تەنیا و تەنیا بۆ خوایە.

تێبینی: مەرج نییە هەرچی بە تەقواترین نەبێ نەچێتە بەهەشت وەک لە(صیغەی تفضیل) وەردەگیرێ، چوونکە لە دەقەکانی تر لە و ڕاستیە تێ دەگەین.

## سورەتی العلق

أَوۡ أَمَرَ بِٱلتَّقۡوَىٰٓ ۝١٢

خوای گەورە سەرزەنشتی(ئەبوو جەهل) و هاو وێنەکانی دەکات بۆ لە جیاتی فەرمان بە خراپە و ڕێگری لە بەندەکانی خوا فەرمان ناکەن بە تەقوا، کە وێنای هەموو چاکە و جوانیەکان دەکات.

# بەرهەمەکانی تەقوا بە پوختی

١. بەهرەمەند بوون لە قورئانی پیرۆز .(البقرە-٢)

٢. سەرفرازی و سەرکەوتن. (البقرە-٥)

٣. سوود وەرگرتن لە ئامۆژگاریەکان. (البقرە-٦٦)

٤. چاکترین پاداشت لای خوای گەورە. (البقرە-١٠٣)

٥. پارێزکار ئەهلی چاکەکاریە. (البقرە-١٧٧)

٦. خوا لەگەڵ تەقوا دایە . (البقرە-١٩٤)

٧. ڕۆژوو لە پێناوی تەقوا دایە. (البقرە-١٨٣)

٨. تەقوا باشترین تێشویە. (البقرە-١٩٧)

٩. دڵنیا بوون لە سزای خوا (البقرە-١٩٦)

١٠. تەقواکاران لە سەرووی بێ باوەڕان دان و گاڵتەیان پێ دەکەن. (البقرە-٢١٢)

١١. تەقوا دەمان پارێزێ لە سووێندی تاوانکارانە. (البقرە-٢٢٤)

١٢. تەقواکار مافەکان دەدات بە خاوەن مافەکان (البقره-٢٣٣)

١٣. ئەو کەسەی لێبووردەیە لە هەرکەس نزیکترە لە تەقوا. (البقره-٢٣٧)

١٤. تەقوا دەمان پارێزێ لە ڕیبا (البقره-٢٧٨)

١٥. تەقوا پارێزکارییە لە بە کەم گرتنی مافی خەڵک . (البقره-٢٨٢)

١٦. بەرهەمی تەقوا فێربوونە. (٢٨٢)

١٧. تەقواکار شایەتمانی ناشارێتەوە .(البقره-٢٨٢)

١٨. تەقوا وامان لێدەکات خیانەت بە قەرزو و بارمتە و سپاردە نەکەین. (البقره-٢٨٣)

١٩. پارێزکاران لە ناو چەندین ناز و نیعمەتی بەهەشتدان. (ال عمران-١٥)

٢٠. پارێزکار خۆشەویستی خوایە. (ال عمران-٧٦)

٢١. پارێزکار فێڵی فێڵبازان نایبەزێنێ. (ال عمران-١٢٠)

٢٢. بەرهەمی تەقوا مەدەدوو یارمەتی فریشتەکانە. (ال عمران-١٢٥)

٢٣. سەرکەوتن لە کایەکانی ژیان بەرهەمی تەقوایە. (ال عمران-١٣٠)

٢٤. پارێزکاران دەچنە بەهەشت کە پانیەکەی بە قەدەر ئاسمان و زەویە. (ال عمران-١٣٥)

٢٥. پارێزکاران خاوەنی پاداشتی گەورەن (ال عمران-١٧٩)

٢٦. بەرهەمی تەقوا گەیشتنە بە پلەی ئیرادە بە هێزی و عزیمەت. (ال عمران-١٨٦)

٢٧. بەرهەمی تەقوا گەیشتنە بە پلە و پایەی سوپاس گووزاری. (ال عمران-٢٠٠)

٢٨. پارێزکاران سوود وەردەگرن لە مێژووی خەراپەکاران و ڕوونکردنەوە و ئامۆژگاری. (ال عمران-١٣٨)

٢٩. باشترین دوواڕۆژ هەیە بۆ پارێزکاران. (النساء-٧٧)

٣٠. تەقوا دەستی مرۆڤ دەگرێ بۆ صولح لەگەڵ هاوسەرەکەی ناهێڵێ ستەم بکات. (النساء-١٢٩)

٣١. پارێزکار لە هەموو کەس لە دادگەری نزیکترە. (المائده-٨)

٣٢. پارێزکاران کردەوەکانیان قبووڵ دەکرێ. (المائده-٢٧)

٣٣. تەقوا تاوانەکان ڕەش دەکاتەوە. (المائده-٦٥)

٣٤. پارێزکاران حەرەج و تاوانیان لەسەر نیە. (المائده-٩٣)

٣٥. ئەوانەی پارێزکارن ڕزگاریان دەبێ لە سیفەتی ئەوانەی کە لە ناهەق ڕۆدەچن. (الانعام: ٦٨-٦٩)

٣٦. پارێزکاران پەند وەردەگرن و بیریان دەکەوێتەوە. (الانعام-٦٩)

٣٨. تەقوا هۆکاری کرانەوەی فەر و بەرەکەتی ئاسمان و زەویە. (الاعراف-٩٦)

٣٩. میرات گری زەوی بۆ پارێزکارانە. (الاعراف-١٢٨)

٤٠. تەقوا مرۆڤ دەکات بە شایەتی ڕەحمەتی خوا. (الاعراف-١٥٦)

٤١. براوەی دوواڕۆژ پارێزکارانن. (الاعراف-١٦٩)

٤٢. ئەگەر پارێزکار زەلەشی پێ براو تاوانی کرد زوو بە ئاگا دێتەوە و بەرپێی خۆی دەبینێ. (الاعراف-٢٠١)

٤٣. تەقوا بەرەو سوڵحمان دەبات لە پێناو برایەتی. (الانفال-١)

٤٤. تەقوا ژیری و زانستمان پێ دەبەخشێ کە حەق و ناحەق لەیەک جیا دەکەینەوە. (الانفال-٢٩)

٤٥. تەقوا کاران نزیکترین کەسانێک بەماڵەکانی خوای گەورە. (الانفال-٣٤)

٤٦. تەقوا ڕێگایە بۆ گەیشتن بە ڕەحمەت و لێ بووردەیی خوای گەورە. (الانفال-٦٩)

٤٧. پارێزکاران ئەوانەن کە بەڵێن و پەیمان دەپارێزن بەوەش دەبن بە خۆشەویستی خوا. (التوبە-٤)

٤٨. قبوڵ نەکردنی ستەم نیشانەی تەقواکاریە و بەمەش خوای گەورە لەگەڵ تەقواکارانە. (التوبە-٣٦)

٤٩. تەقواکار خۆی لە جیهاد نادزێتەوە. (التوبە-٤٤)

٥٠. هەرشتێک لەسەر تەقوا دامەزرێ لە هەرشتێک بە بەرەکەت ترە جا مزگەوت بێ یان غیری مزگەوت. (التوبە-١٠٩)

٥١. توندی بەرامبەر بێ باوەڕانی دەست دێژی کار، نیشانە و بەرهەمی تەقوایە. (التوبە-١٢٣)

٥٢. سوود وەرگرتن لە بەڵگە و نیشانەکانی پەروەردگار. (یونس-٦)

٥٣. پارێزکاران وەلی پەروەردگارن، ئەوانیش لە دڵنیایی و ئەماندان لە دونیا و دوواڕۆژ. (یونس-٦٤)

٥٤. پارێزکاران مزگێنی خەونی خۆشیان بۆ هەیە لە دوونیا دا. (یونس-٦٤)

٥٥. سەرنجام و داهاتوو بۆ پارێزکارانە لە دوونیا و دوواڕۆژ. (هود-٤٩)

٥٦. پارێزکاران خۆڕاگرن بە ئازیزانیان شاد دەبنەوە. (یوسف-٩٠)

٥٧. بەرهەمی تەقوا ئەوەیە کە هەرگیز خاوەنەکەی ڕەنجی بە زایا ناچێ. (یوسف-٩٠)

٥٨. سێبەری دووروو درێژ و فراوان و بەردەوام بۆ پارێزکارانە. (الرعد-٣٥)

٥٩. پارێزکاران دوواڕۆژیان زۆر باشترە لە دونیایان. (یوسف-٥٧)

٦٠. بۆ عاقڵ مەندان کە پارێزکارانن دوواڕۆژ بۆ ئەوان لە هەر شتێک باشترە. (یوسف-١٠٩)

٦١. پارێزکاران بە سەلام و دڵنیاییەوە دەچنە بەهەشت. (حجر-٤٥)

٦٢. دڵیان بەرامبەر بە یەک خاوێن دەبێتەوە و کینە و بوغزی تێدا نامێنێ. (حجر-٤٧)

٦٣. لە بەهەشتا ماندوو نابن و وە دەرنانرێن. (حجر-٤٨)

٦٤. تەقواکار هەتا ئەوپەڕ ڕێز لە میوان دەگرێ و قوربانی بۆ دەدا. (حجر-٦٩)

٦٥. دابەزینی پەیامەکان و پەیامبەران بۆ ئەوەیە خەڵکی پارێزکار بن. (النحل-٢)

٦٦. پارێزکاران هەرشتێک لە خواوە بێ بە خێروو چاکەی دەبینن. (النحل-٣٠)

٦٧. خوای گەورە مەدحی (دارالمتقين) دەكات واتە مەدحی شوێنی نیشتە جێبوونیان دەكات ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوپەڕی خۆشی بۆ پارزكاران. (النحل-٣٠)

٦٨. تەقواكاران لە كاتی سەرەمەرگ و چونە بەهەشتیان فریشتەكان و بەڕووی خۆش سەلامەوە پێشوازیان دەكەن. (النحل: ٣١-٣٢)

٦٩. خوا لەگەڵ تەقواكاران دایە بە پشتیوانی كردن و تەوفیق، ئەو پارێزكارانەی خۆڕاگر و لێبووردەن و چاو پۆشی دەكەن و ڕقی خۆیان دەخۆنەوە. (النحل-١٢٨)

٧٠. وە تەقوا لە سیفەتە بەندە تایبەتەكەی خوایە كە یەكێك لەوانە یەحیای كوڕی زەكەریایە سەلای خوایان لەسەر بێ. (مريم-١٢)

٧١. وە تەقوا لە سیفەتە بەرز و دیاركانی پێغەمبەرانە عليهم الصلاة والسلام. (مريم-١٢)

٧٢. تەقوا مرۆڤ دوور دەخاتەوە لە ئارەزوو بازی وە پەیوەندی ناشەرعی. (مريم-١٨)

٧٣. مرۆڤە باشەکان ئەگەر بە خوا ترسێنران لە خەراپە دوور دەکەونەوە. (مەیم-١٨)

٧٤. واریس و میرات گرانی بەهەشتی پەروەردگار پارێزکارانن. (مریم-٦٣)

٧٥. ئەوانەی لە پردی (سراط) ڕزگاریان دەبێ تەنیا پارێزکارانن. (مریم-٧٢)

٧٦. پارێزکاران بە شێوەی نوێنەروو وەفدی ڕێز لێگیراوو حەشر دەکرێن لە دوواڕۆژ. (مریم-٨٥)

٧٧. ئەم قورئانە بۆیە دابەزیوە مزگێنی بێ بۆ پارێزکاران و تۆقێنەر بێ بۆ بێ باوەڕە سەر سەختەکان. (مەیم-٩٧)

٧٨. قورئان بۆیە دابەزیوە و ڕونکراوەتەوە بە عرەبی بۆ ئەوەی خەڵک بیری لێ بکاتەوە و تەقوایان پەیدابێ. (طە-١١٣)

٧٩. عاقیبەت بۆ ئەهلی تەقوایە ئەوانەی خۆڕاگرن لەسەر پەروەردەی ماڵ و منداڵ، بەتایبەت نوێژ کردن و خۆشەویستی بۆ نوێژ. (طە-١٣٢)

٨٠. ئەهلی تەقوا بەهرەمەندن لە کتابە ئاسمانیەکان. (الانبیاء-٤٨)

٨١. تەقوا ڕزگارمان دەکات لە زەلزەلە و ناڕەحتی دوواڕۆژ بۆیە پەروەردگار ئامۆژگاریمان دەکات بە ترس و خۆ پاراستن لەو ڕۆژە. (الحج:١-٢)

٨٢. بە گەورە گرتنی درووشمەکانی دین نیشانەی تەقوای دڵە.(الحج-٣٢)

٨٣. تەقوا واتا ئیخلاس و بۆ خوا دڵسۆزی، کە خوای گەورە لە سەر بڕینی ئاژەڵان تەنیا ئەوەی لە ئێمە دەوێ. (الحج-٣٧)

٨٤. تەقوا بانگەوازی پێغەمبەرانە بۆ گەلەکانیان علیه الصلاة والسلام. (المومنون-٢٣)

٨٥. تەقوا دەمان پارێزێ لە تەفرەقە. (المومنون-٥٢)

٨٦. کەسێک بزانێ خوای گەورە پەروەردگاری ئاسمان و زەویە و دانی پێدا بێنێ دەبێ تەقوا لە خوای گەورە بکات. (المومنون-٨٧)

٨٧. وە بەرهەم و سەمەری ناسینی خوا تەقوا لێکردنە. (المومنون-٨٧)

٨٨. تەقوا لەگەڵ گوێڕایەڵی و ترسان لە خوای گەورە هۆکاری سەرکەوتنە لە دووارِۆژ. (النور-٥٢)

٨٩. دەبێ نزا بکەین کە ببئنە ئیمام بۆ پارێزکاران. (الفرقان-٧٤)

٩٠. تەقوا لەگەڵ ستەم دا بە هەموو شێوەیەک ناکۆکە. (الشعراء-١١)

٩١. بەهەشت جوان دەکرێ و دەڕازێتەوە بۆ پارێزکاران. (الشعراء-٩٠)

٩٢. تەقوا وەسیەتی پێغەمبەر نوحە بۆ گەلەکەی کە بەچاوی کەم تەماشای هەژارەکانایان دەکرد. (الشراء-١٠٨)

٩٣. تەقوا وەسیەتی پێغەمبەر هودە بۆ گەلەکەی کە بێباوەڕەکان بە هەموو جۆرێک هەژارەکانیان دەچەوساندەوە بۆیە دووجار وەسیەتیان بۆ دەکات بە تەقوا. (الشعراء:١٢٦-١٣٢)

٩٤. تەقوا وەسیەتی صالحە بۆ گەلەکەی کە چەوساندنەوەیان کردبووە پیشە و موسرف و زیادەڕۆ کاران کاروو باریان بە دەست بوو، ئەویش پێیان دەڵێ لە خوا بترسن بە قسەی ئەوان مەکەن کە کاریان خواپەکاریە و چاکە ناکەن وێڕای ئەوەش وشترەکەیان سەر بڕی کە وەک موعجیزە بۆیان هاتبوو. (الشعراء: (١٥١-١٥٢)

٩٥. تەقوا وەسیەتی لوط پێغەمبەرە بۆ گەلەکەی کە خراپترین کردەوەیان دەکرد کە هاوڕەگەز بازییە، دواتر بەقسەیان نەکرد و ژێراو ژوور بوون و بەرباد بوون. (الشعراء-١٦١)

٩٦. تەقوا وەسیەتی شوعیبە بۆ گەلەکەی کە زیادوو کەمیان دەکرد لە پێوانەدا. (الشعراء-١٧٩)

٩٧. ئەوانەی لە سزای گەلی سەموود ڕزگار بوون تەنیا پارێزکاران بوون. (النمل-٥٣)

٩٨. تەقوا مرۆڤ فێری خۆ بە کەم گری دەکات، وە وای لێدەکات خۆی بەرز نەنوێنێ و ستەم نەکات. (القصص-٨٣)

٩٩. بەندایەتی و تەقوا لە هەرشتێک باشترە مرۆڤ کە وریا و زانا بێ. (العنکبوت-١٦)

١٠٠. دین و پارچە پارچە کردن و بوون بە تاقم تاقم پێچەوانەی تەقوایە، واتە بەرهەمی تەقوا پارچە پارچە نەبوونە. (الروم-٣١)

١٠١. تەقوا دەمان پارێزێ لە فریو خواردن بە دوونیا. (لقمان-٣٣)

١٠٢. تەقوا دژ بەیەک بوون و ناکۆکیە لەگەڵ گوێڕایەڵی بێباوەڕ و دووڕووەکان. (الاحزاب-١)

١٠٣. تەقوا کار وەک هیچ کەسێک نییە، واتە لە هەرکەسێک باڵاترە ئەگەر پابەندی داخوازی تەقوا بێ. (الاحزاب-٣٢)

١٠٤. تەقوا تەواو ناکۆکە لەگەڵ ستەم کردن لە خێزان و هاوسەر. (الاحزاب-٣٧)

١٠٥. تەقوای ڕاستە قینە ئافرەت والێدەکات تێکەڵ بە پیاوانی بێگانە نەبێ مەگەر بەناچاری و بەرگی شەرعییەوە نەبێ. (الاحزاب-٥٥)

١٠٦. تەقوا وامان لێدەکات وتەکانمان جوان و لە جێ بن. (الاحزاب٧٠)

١٠٧. تەقوا ڕەحمەت و بەزەیی خوامان بۆ دێنێ. (یس-٤٥)

١٠٨. یەکەم وەسیەتی ئیلیاس بۆ گەلەکەی تەقوا بوو کە گیرببوون بە بت پەرستیەوە. (الصافات-١٢٤)

١٠٩. تەقوا کار بە هیچ جۆرێک وەک خەراپکار نیە، ناچنە تەرازوویەکەوە نە لە دوونیا نە لە دوواڕۆژ. (ص-٢٨)

١١٠. باشترین سەرنجام و شوێنی حەوانەوە بۆ پارێزکاران هەیە. (ص-٥٤)

١١١. تەقوا ڕێگایە بۆ خۆ ڕاگری و چاکەکاری. (الزمر-١٠)

١١٢. تەقوا دەمان پارێزی لەوەی کە ئاگر ببێتە سێبەرمان وەک بێ باوەڕەکان. (الزمر-١٦)

١١٣. بۆ پارێزکاران چەندین کۆشکی بەرز و قات قات و باڵا هەن. (الزمر-٢٠)

١١٤. پارێزکار بەهرەمەندە لەو قورئانەی کە بە زمانی عرەبی دابەزیوە. (الزمر-٣٥)

١١٥. تەقواکار هەم ڕاستە و هەم پشتیوان لە ڕاستی دەکات. (الزمر-٣٥)

١١٦. ئەهلی ئاگر خۆزگە دەخوازن کە تەقواکار بان. (الزمر-٥٧)

١١٧. تەقواکاران لە قیامەت دا ڕزگار بووە لە نارەحەتیەکانی دوواڕۆژ. (الزمر-٦١)

١١٨. لە بەرامبەر ئەوەی کە بێباوەڕان دوونیایان هەیە و زەخرەفە و زریق و بریقی دوونیایان هەیە تەقواکاران دوواڕۆژیان هەیە. (الزخرف-٣٥)

١١٩. خوای گەورە یاروو یاوەری تەقواکارانە لە بەرامبەر ئەوەدا کە ستەم کاران دۆست و نزیکی یەکترن. (الجاثیة-١٩)

١٢٠. ڕووباری ئاوی سازگار و شیر و شەڕاب و هەنگووین، وە هەموو میوەیەک وە لێخۆش بوون، هەموو ئەمانە بۆ پارێزکارانە. (محمد-١٥)

١٢١. تەقوا ناوە بۆ تەوحید، ئیخلاص. (الفتح-٢٦)

١٢٢. موتەقی پێش خواو پێغەمبەرەکەی هەرگیز بڕیار نادا. (الحجرات-١)

١٢٣. ئەدەب لەخزمەتی پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام دەنگ بەرز نەکردنەوە لە خزمەتیا بە زیندوویی و مردوویی. (الحجرات-٣)

١٢٤. بەرهەمی تەقوا کەوتنە بەر ڕەحمەتی پەروەردگار و صولح کردنە. (الحجرات-١٠)

١٢٥. پێوەری چاکترین بوون تەقوایە. (الحجرات-١٣)

١٢٦. بەهەشت لە پارێزکاران دوور نابێ. (ق-٣١)

١٢٧. تەقواکاران ئەوانەن پابەندن بە بەخشین و شەونوێژ و بیرکردنەوە. (ال ذاريات: ١٥-٢٠)

١٢٨. تەقوا دژی پاکانەی خۆ کردنە. (النجم-٣٢)

١٢٩. تەقواو ئیمان پاداشت دوو قات دەکاتەوە. (الحديد-٢٨)

١٣٠. پێویستە چپە چپی مسوڵمانان بۆ تەقواو پارێزکاری بێ. (المجادلة-٩)

١٣١. تەقوا وازهێنانە لە تاوان. (الحشر-٧)

١٣٢. تەقواکاران دوورن لە بەخیلی. (الحشر-٩)

١٣٣. تەقوا واتە بینینی قیامەت هەر وەکوو سبەی، واتا بە نزیکی دەیبینن. (الحشر-١٨)

١٣٤. هاوکاری کردنی ماددی لە نێوان بڕوواداران نیشانەی تەقوایە. (الممتحنه-١١)

١٣٥. تەقوا بە پێی تواناتە. (اليغابن-١٦)

١٣٦. پارێزکار دەبێ ڕەچاوی کاتەکانی عیددە بکەن لەکاتی تەڵاقدان و گێڕانەوەدا بۆ ئەوەی نەکەونە ناو حەرام. (ال طلاق-١)

١٣٧. تەقواکاران لەکاتی خۆیدا نەبێ خێزانیان تەڵاق نادەن، بە داخەوە دەبینین بەشێکی زۆر لە مسوڵمانان خێزانیان تەڵاق دەدەن بەبێ بیانوویەکی ڕاستەقینە، وە سێ بە سێ تەڵاق دەدەن، وە ڕەچاوی کاتی تەڵاق دان و گێڕانەوە ناکەن. (الطلاق-٣)

١٣٨. نابێ ئافرەت دوای تەڵاق دان لە ماڵەکەی دەر بکرێ. (الطلاق-١)

١٣٩. دەبێ تەقواکار نەفەقەی خێزانە تەڵاق دراوەکەی بدات. (الطلاق)

١٤٠. دەبێ تەقواکار سوکنە و شوێنی نیشتەجێبوون بۆ خێزانەکەی دابین بکات دوای تەڵاق دان. (الطلاق)

١٤١. نابێ موتقی زیان بە خێزانە تەڵاق دراوەکەی بگەیەنێ. (الطلاق)

١٤٢. تەقواکار لەکاتی گێڕانەوەی خێزانەکەی شاهید دەگرێ. (الطلاق)

١٤٣. تەقواکار خوای گەورە دەرووی خێری لێدەکاتەوە. (الطلاق)

١٤٤. تەقواکار خوای گەورە ڕۆزی پێ دەبەخشێ بە بێ ئەوەی هەستی پێبکات. (الطلاق)

١٤٥. تەقواکار خوای گەورە پاداشتی بۆ گەورە و زیاد دەکات. (الطلاق)

١٤٦. تەقوا ژیری پەیدا دەکات. (الطلاق)

١٤٧. تەقواکار خۆی و ماڵ و منداڵی لە ئاگر دەپارێزێ. (الطلاق)

١٤٨. تەقواکار بیردەکاتەوە و پەند و ئامۆژگاری وەردەگرێ.

١٤٩. خوای گەورە خۆی شایەنی ئەوەیە کە تەقوای لێبکرێ. (المدثر-٥٦)

١٥٠. تەقوا لە بەرامبەر هەموو خەراپەکاریەکان داندراوە. (الشمس-٨)

١٥١. تەقوا ڕێگا ئاسان دەکات بۆ بەهەشت. (الليل-٧)

١٥٢. موتقی دوور دەخرێتەوە لە ئاگر. (الليل-٢١)

١٥٣. فەرمان کردن بە تەقوا لە هەر کارێک باشترە. (العلق-١٢)

## كۆتایی

سوپاس بۆ خوای گەورە ئەم نووسینە بە كۆتا گەیشت، كە كۆكردنەوەی ڕێگاكانی گەیشتن بە تەقوا و بەرهەمەكانی بوو، گومان لەوە نیە هەر وشەیەک قوئان بەكاری هێنابێ حیكمەتی زۆری تێدایە، چونكە بەردەوام قورئان وشە عرەبیەكان لە واتای خۆی زیاتر بەكار دەهێنێ، بۆیە هەر وشەیەكی قورئان لێكۆڵینەوەی لەسەر بكرێ بۆمان دەردەكەوێ كە قورئان واتاكەی چەند فراوان كردووە، ئەوەی من كردوومە لێكۆڵینەوە نیە بەڵكوو بەس لەبەر چاو گرتنی بەرهەمی تەقوایە، وە من نەچوومە ناو وردەكاریەكانی بەرهەمی تەقوا بەڵكوو تەنیا كۆكردنەوەی گشتییە ئەمە دەبێتە دەستپێک بۆ ئەوەی زیاتر و زیاتر بەرهەم ق ڕێگاكانی تەقوا لەبەر چاو بگرین، چونكە ئەم دوو بابەتە ئامانجی گەورەن لە قوریانی پیرۆزدا.

**وصلى الله وسلم على سيدنا محمد وآله وصحبه اجمعين**

# پێرست

پێشەکی........................................................ ٣

مانای)تقوی( لە زمانەوانیدا.............................. ٤

تقوی لە زاراوەی شرعیدا.............................. ٥

سورەتی البقره.............................................. ٦

سورەتی ال عمران......................................... ٢١

سوڕەتی النساء............................................. ٢٧

سوڕەتی المائده............................................ ٢٩

سوڕەتی االنعام............................................ ٣٥

سوڕەتی الاعراف.......................................... ٣٦

سوڕەتی الانفال........................................... ٣٩

سورەتی التوبه.......................................... ٤١

سورەتی یونس............................................. ٤٤

سورەتی هود........................................... ٤٥

سورەتی یوسف.............................................. ٤٦

سورەتی الرعد.................................................... ٤٧

سورەتی حجر...................................................... ٤٧

سورەتی النحل.................................................... ٤٨

سورەتی مريم..................................................... ٥٠

سورەتی طه........................................................ ٥١

سورەتی االنبياء................................................. ٥٢

سورەتی الحج..................................................... ٥٣

سورەتی المؤمنون............................................... ٥٤

سورەتی النور..................................................... ٥٥

سورەتی الفرقان.................................................. ٥٦

سورەتی الشعرا.................................................. ٥٦

سورەتی النمل.................................................... ٦١

سورەتی القصص................................................ ٦١

سورەتی العنكبوت............................................. ٦٢

سورەتی الروم................................................... ٦٢

سورەتی لقمان................................................... ٦٣

سورەتی االحزاب........................................................ ٦٣

سورەتی یس.............................................................. ٦٦

سورەتی الصافات...................................................... ٦٦

سورەتی ص.............................................................. ٦٦

سورەتی الزمر........................................................... ٦٧

سورەتی غافر............................................................ ٧٠

سورەتی فصلت.......................................................... ٧١

سورەتی الزخروف...................................................... ٧١

سورەتی الدخان......................................................... ٧٢

سورەتی الجاثية........................................................ ٧٣

سورەتی محمد........................................................... ٧٤

سورەتی الفتح........................................................... ٧٥

سورەتی الحجرات...................................................... ٧٥

سورەتی ق.............................................................. ٧٨

سورەتی الذاريات...................................................... ٧٨

سورەتی الطور.......................................................... ٧٩

سورەتی النجم........................................................ ٨٠
سورەتی الحديد...................................................... ٨١
سورەتی المجادلة.................................................... ٨١
سورەتی الحشر....................................................... ٨٢
سورەتی الممتحنة................................................... ٨٣
سورەتی التغبن...................................................... ٨٣
سورەتی الطلاق...................................................... ٨٤
سورەتی التحريم..................................................... ٨٧
سورەتی القلم........................................................ ٨٨
سورەن الحاقة........................................................ ٨٨
سورەتی نوح.......................................................... ٨٨
سورەتی المزمل...................................................... ٨٩
سورەتی المدثر...................................................... ٨٩
سورەتی الدهر....................................................... ٨٩
سورەتی المرسلات.................................................. ٩٠
سورەتی النبأ......................................................... ٩٠

